له چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

زنجیرەی ژیاندنەوەی کەلەپووری ئەدەبی کورد ـ ژمارە ( ٢ )



# شیرین و خوسرەو

شاکاری شاعیری ناوداری کورد

## خانای قوبادی

محمدی مەلاکریم
ئەندامی یاریدەری کۆڕی زانیاری کورد
ساغی کردوەتەوە و فەرهەنگی بۆ رێکخستوە و
پێشەکیی بۆ نوسیوە

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا
١٩٧٥



لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد
زنجیرەی ژیاندنەوەی کەلەپوری ئەدەبی کورد ــ ژمارە ( ٢ )

# شیرین و خوسرەو

شاکاری شاعیری ناوداری کورد

## خانای قوبادی

محمدی مەلاکریم
ئەندامی یاریدەری کۆڕی زانیاری کورد
ساغی کردوەتەوە و فەرهەنگی بۆ ڕێکخستوە و
پێشەکیی بۆ نوسیوە

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا
١٩٧٥

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

# شيرين وخسرو

رائعة الشاعر الكردي الذائع الصيت

## خاناى قبادى

حققه و رتب قاموسه و قدم له

محمد الملا عبد الكريم

العضو الموآزر للمجمع العلمي الكردي

مطبعة المجمع العلمي الكردي

بغداد ــ ١٩٧٥



**خانای قوبادیێ**

**وەك بە خەیاڵی هونەرمەندی کورد ( بدیع باباجان )دا هاتوە**

# پێشەکی

تازە لە چاپکردنی ( دیوانی مەولەوی ) بوبوینەوە ، باوکم لە دانیشتنێکیا لەگەڵ خوا لێخۆشبو ئەحمەد بەگی توفیق بەگ ئاگادار ئەبێ کەوا ناوبراو ( شیرین و خوسرەو )ێکی کۆنی ( خانای قوبادی )ی لایە . لێی وەرئەگرێ و ئەیهێنێتەوە . کە سەیرمان کرد و هەندێکمان لێ خوێندەوە هاتینە سەر ئەو باوەڕە کەوا پێویستە بینوسینەوە و ئامادەی بکەین بۆ چاپ .

( شیرین و خوسرەو )ەکەی ئەحمەد بەگ لە ساڵی (١٢٣٥) یا (١٢٤٥)ی کۆچی « ١٨١٩ ــ ١٨٢٠ یا ١٨٢٩ ــ ١٨٣٠ ی زایینی »دا لە دێی ( کەیمنە ) لە هەورامانی لوهۆن کە ئیستا بەر ئێران کەوتوە ، نوسرابوەوە . نوسخەیەکی ناتەواو بو نوسیارەکەشی باسی ئەوەی کردبو . وێنەی بۆ گەلێ دیمەنی ڕازەکەش کێشابو . ئەتوانم بڵێم تێکڕای وێنەکانی لەو وێنانە سەرکەوتوتر بون کە لە هەندێ کتێبی لەم بابەتەی بە ( چاپی بەرد ) لەچاپدراوی ئەوسای ئێران و هیندا ئەیانبینین . بەداخەوە ئیستا ئەو نوسخەیەمان بە دەستەوە نیە تا زەنکۆگرافی ئەو وێنانە وەرگرین و وەك یادگاری هونەرمەندێکی کورد بڵاویان کەینەوە . ئەگەر بۆم ڕێکەوت جارێکیتر ئەو نوسخەیەم بکەوێتەوە دەست ، هەوڵ ئەدەم ئەو وێنانە بە وتارێکەوە بڵاو بکەمەوە .

لە ماوەی کاری نوسینەوەی ئەو نوسخەیەدا بۆمان دەرکەوت نوسخەکە هەڵەیەکی زۆری تیایە و گەلێ شوێنیشی بە ئاسانی ناخوێنرێتەوە و پێویست بە دانەیەك یا زیاتری هەمان کتێبە بۆ بەراورد و ڕاست کردنەوە . بۆیە بانگەوازێکمان لە ڕۆژنامەی ( ژین )دا* بڵاو کردەوە بۆ داوای یارمەتی . ئەوەی بە دەنگمانەوە هات تەنها هاوڕێی ئەدیبم ( کاکەی فەلاح ) بو . دانەیەکی دەسنوسی لای هاونیشتمانێکی دارتاش بۆ پەیدا کردین و بۆی

---

* ڕۆژنامەی ژین ، ژمارە (١٦٧١)ی ساڵی (٣٧) ، ١٩٦٢/٥/٤

ناردێن . ڕاستەکەی ئەو دانەیە هەرچەند بە بەراورد لەگەڵ دانەکەی مـاڵی ئەحمەد بەگدا لەمێژ نەبو نوسرابوەوە ، گەلێکی یارمەتی داین . ئـەم کتێبەی ئێستا لە بەردەستی خوێندەوارانایە بەرهەمی لەیەکدان و بەراوردی ئەو دوو دانەیەیە .

کە لێبوینـەوە نوسخەکەی ماڵی ئەحمەد بەگمان دایـەوە بە خاوەنی و ئەوی سولەیمانیشمان ناردەوە بۆ کاکەی فەللاح . پاشان ، وەك زانیم ، کاکە ئەو نوسخەیەی لە خاوەنەکەی وەرگرتوە و ناردویە بۆ مامۆستا (م . ئەورەنگ) کە ڕۆشنبیرێکی کوردی ئێرانە ، خۆی بە تۆژینـەوەو لێکۆڵینەوەی زمان و کەلەپوری ئەدەبی کوردەوە خەریك کردوە .

نوسخە لێکۆڵراوەکەی ئێمە هەر وا بە بێکەس لەنـاو کتێبخانەکەماندا مایـەوە . ڕاستـەکەشی هەرچەنـد بیـرم لێ ئەکـردەوە لەچـاپدانی کتێبێکی وا زل چەنـد زۆری تێ‌ئەچێ ، هیوای لەچاپدانی لـە دڵم ئەبڕا و لە دڵی خۆما ئەموت با بۆ خۆی بکەوێ . تا ئەمـساڵ پاش گەڕانەوەم لە مۆسکۆ لەگەڵ برای بەڕێزم دوکتۆر کەمال مەظهەر ئەحمەدی ئەمێنداری گشتیی ئەو سەردەمەی کۆڕی زانیاری کورددا باسی ئەم کتێبەم ئەکرد . دوکتۆر کەمـال بڕیاری دا بێخـاتە بەردەمی ئەنجـومەنی کۆڕ تا لە مەسـەلەی لەچـاپدانی بکۆڵنەوە . زۆری نەخایاند بڕیار درا و دەس‌کرا بە لەچاپدانی و ئەوەتا ئێستا لە بەردەستی خوێندەوارانی ئازیزدایە .

ڕاستتان ئـەوێ مەسـەلەی بڕیـاردانی چاپ‌کردنی ئـەم ( شیرین و خوسرەو )ە زۆر زوو بڕایـەوە . تا ئەو کاتە هێشتـا فەرهەنگۆکەکەی ئامادە نەکرابو . دیارە ئەم پێشەکییەشی بۆ نەنوسرابو .. خۆ ئاشـکراشە نەخرابوە سەر شێوەی ڕێنوسی کۆڕ . لەگەڵ دەست‌کردن بـە لەچاپدانیا وردە وردە خرایە سـەر ڕێنوسی کۆڕ و پاش لێبونەوەش لە چاپ فەرهەنگۆکەکەی ئامادە کرا . بۆیە ئەو ناتەواوییانەی بەر چاوی خوێندەوارانی خۆشـەویست ئەکەون هەندێکیان ئەگەڕێنـەوە بۆ کاری پەلـە ، بەڵام هەرچـۆن بێ ئەو بـە پەلە لەچاپدانە با ناتەواویش بێ ـ گەلێ لە لەچاپنەدان و هەل لەکیس‌دان چاترە.

بۆیە ، من بـەر لەوەی ڕەخنەگر ڕەخنـەم لێ بـکرن ، نەك لـە ترسی ڕەخنە ، بەڵکو چونکە بنیادەم خۆی بە ناتەواویی خۆی بزانێ چاترە ، پێ لە ناتەواوییەکانی کارەکەم ئەنێم و ئەوانەیان‌هەستم پێ کردوێ ئەیانخەمە ڕوو.جا خوێندەواریش دەرکی بە چیی‌تر کرد زۆر پێ‌خۆش‌حاڵم گوێی بۆ ڕاگرم و بەڵکو ئەگەر جارێکی‌کە کەسێکی‌تر بـە جۆرێکی‌تـر ئەم شاکـاری ئەدەبی کوردەی

لەچاپدابەوە کەڵك لە ناتەواییەکانی کارەکەی من وەربگرێ و هەڵەکانم راست بکاتەوە و هەمۆشمان ئەزانین هیچ کارێك یەکەن دەردۆ بە تەواوێ و پوختەیێ نایەتە ئەنجام ، هەرچەند ناشبێ ئەمە بکەین بە پاساودەری کەم و کورتێ و ناتەواوێمان .

ناتەواوێی یەکەم ئەوەیە لەبەر ئەوەی لە سەرەتادا هەر نوسخەکەی ئەحمەد بەگم بە دەستەوە بو زیاتر پشتم بەو نوسخەیە بەستوە و جیاوازییەکانیم لەگەڵ نوسخەی سولەیمانێ لە پەراوێزەکەدا نۆسیوە « ( أ )م کردوە بە نیشانەی نوسخەی ئەحمەد بەگو ( ب )م کردوە بە نیشانەی نوسخەی سولەیمانێ » . کەچی پاشان لە کاتی لەچاپدانا بۆم دەرکەوت تێکڕا نوسخەکەی سولەیمانێ پشت پێ بەستراوترە ، هەم لەبارەی بەڕاستێ نۆسینەوە و هەم لەبارەی جیاوازێی هەندێ ڕستە و وشەشەوە .

ناتەواوییەکی‌تر ئەوەیە بەهۆی ئەوەوە کە شێوەی نۆسینەوەی کوردێی جاران وەك نۆسینەوەی فارسێ وابو ، زۆر جار ( گ ) ئەکرا بە ( ك ) و دۆ نوختە ئەبۆ بە یەك نوختە و بەپێچەوانەشەوە و ، ( و )ی عەطف و ( ی )ی ئیضافە ئەپەڕین ــ هەندێ هەڵە لە نۆسینەوەدا ڕۆی داوە . لەوانەیە هەندێ وشەش بەهۆی نەنۆسینی جارانی حەرفی حەرەکەوە ، بە شێوەیەکی نادروست خوێنرابنەوەو لەبەرئەوە بە هەڵە نۆسرابنەوە* . هەندێ ناویش لە هەندێ شوێنا وەك خۆیان نەنۆسراونەتەوە . لەدوایێ ئەم کتێبەوە و لە ( چەوت و ڕاست )ەکەیدا ئیشارەتم بۆ چەند شوێنێکی لەم چەشنە کردوە . هەرچۆن بێ من لام وایە ڕاست کردنەوەی تەواوی ئەو هەڵانە بەسراوە بە دۆزینەوەی نوسخەی ڕاست و دروستی جوان نۆسراوە و بە ئامادە کردنی فەرهەنگی زاراوەی (گۆرانێ)** و بەدەستەوە بۆنی فەرهەنگی زمانە ئێرانییە کۆنەکان و ، من خۆم ئەوەندە ئەتوانم بڵێم بەگوێرەی توانام درێغیم نەکردوە .

ناتەواوییەکی‌تر ئەوەیە ئەو خوێندەوارەی شارەزای زاراوەی گۆرانێ نەبێ تەنها بە سەیرکردنی فەرهەنگۆکی داوێنی کتێبەکە کاری بەتەواوێ مەیسەر نابێ . بەڵام چاریشم نەبو . ئەگەر بمویستایە هەمۆ شیعرێکی یا زوربەی شیعرەکانی لێك بدەمەوە کتێبەکە لای کەمی سێ ئەوەندەی ئیستای

---

* وەك خوێندنەوەی ( موشك ) و ( موشکین ) بە ( میشك ) و ( میشکین ) کە بە شێوەی نۆسینی کۆن وا ئەنۆسران ( مشك ) و ( مشکین ) .

** گۆرانێ ناوی ڕاستەقینە و زانستییانەی ئەو زاراوەیە ئیستا خەڵك پێی‌ئەڵێن ( هەورامێ ) .

لێ دەرئەچوو . ئەوەش واتە لەچاپ نەدانی ، چونکە هەر کۆڕی زانیاری کورد بۆ توانێ ئەرکی لەچاپ دانی بگرێتە ئەستۆی خۆی و ئەویش ئەو دەسەڵاتەی نەبو کتێبێکی لەمە قەبەتر لەچاپ بدا . سەرەڕای ئەوەش وشەیەکی زۆرم لە کتێبەکەدا هاتوەتە ڕێ مەعنایم نەزانیوە ، نەخوازەلا ئەوانەی پەیوەندیان بە کەرەستەی جەنگ و شایی و خشڵ و جل و بەرگی ژنان و ڕاو و ڕابواردنی گەورە گەوران و ڕەنگ و شتیواوە هەیە . لێکدانەوەی ئەمانەش ئەبێ بکەوێتە ئەستۆی ئەوانەی شارەزای ژیانی ڕەسەنی کوردەواری و فۆلکلۆری میللی و زمانە ئێرانییە کۆنەکانن و بێگومان بە لێکۆڵینەوەی ئەم جۆرە وشانە سامانی زمانەوانی و ئەدەبی و فۆلکلۆریمان گەلێ دەوڵەمەند ئەبێ .

ئەمە ئەو ناتەواویانەن کە خۆم هەستم پێ کردوون . لە دەرەتانێکی زۆر تەسکا نەبێ ، کە ئەویش خۆم ئیشارەتم بۆ کردوە ، هەڵەم ڕاست نەکردوەتەوە لە ئەسڵی کتێبەکەدا . هەر دەسکارییەکیشم کردبێ لە پەراوێزەکەدا نوسیومە .

کە مەعنای وشەیەکم لە فەرهەنگۆکەکەدا لێدابێتەوە ، زیاتر تەنها ئەو مەعنایەم لێداوەتەوە کە ئێتشم پێ بوە . ئەگینا زوربەی وشەکان گەلێ مەعنای تریشیان هەیە . لە وشە ڕاستەوخۆ یا بە ڕەسەن عەرەبی و تورکییەکانیشا ئیشارەتێکم کردوە و زیاتر ( ع )ێکم بە مەعنا ( عەرەبی )و ( ت )یەکم بە مەعنا ( تورکی ) نوسیوە . ئەموێست ئەوانیکەشیان بە ( ف = فارسی ) و ( گ = گۆرانی ) و ( کخ = کرمانجیی خوارو ) لێك جوێ بکەمەوە . بەڵام چونکە زوربەی ئەو وشانەی کە لە کتێبەکەدا هەبوون و لە زاراوەی کرمانجیی خوارودا نین ، لە فەرهەنگە ئێرانییەکانم دەرهێناون و لەو باوەڕەشدا نەبوم ( خانا ) ئەو وشانەی وەك وشەی فارسی بەکارهێنابێ ، هاتمە سەر ئەو باوەڕە کەوا ئەو وشانە بە مەعنای تەسکی وشەی فارسی نین ، وشەی ئێرانیی کۆنن تێکەڵن لەنێوان زاراوەیگۆرانی و زاراوە ئێرانییە کۆنەکانیتراو هەندێکیشیان ئێستاش لە زۆر لەو زاراوانەدا ماونەتەوە . من خۆم چونکە شارەزاییەکی زمانەوانیم نیە ناتوانم لەم ڕوەوە لەمە زیاتر بنوسم . هەر ئەوەندە ئەڵێم بە بەکارهێنانی ئەم جۆرە وشانە لە زاراوەی گۆرانیدا وام دێتە پێش چاو گۆرانی ــ کە هەورامیی ئێستا قۆناغێکی تازەترییەتی ــ و زاراوە ئێرانییە کۆنەکان بەچکەی یەك دایکن و پەیوەندییەکی بەتینیان لەنێواندا هەیە. لەبەرئەوەش لە گەلێ شوێنا بەتەنها مەعنا لێدانەوەی یەك وشە کار مەیسەر نەئەبو چونکە ( ضەمیر ) لە زاراوەی گۆرانیدا وەك لە زاراوەی کرمانجیی خوارودا دانانرێ و لەیەككردنەوەی ( فیعل ) و ( ضەمیر )یش ڕاست نەئەبو ،

لە گەڵێ شوێنا مەعنای ڕستەم پێکەوە لێداوەتەوە .

لەدوایێ ئەم بابەتانەشەوە ئەبێ بڵێم کەوا بۆ زانێنی مەعنــای وشـەکان کەڵکم لەم فەرهەنگە ئێرانییانە وەرگرتوە : ( برهان قاطع ، باهتمام دکتر محمد معین ) ، ( فرهنگ عمید ) ، ( واژه نامهء نوین ) ، ( فرهنگ اورنگ ) ، ( فرهنگ مردوخ ) . هەروەها ( فەرهەنگی خاڵ ) و ( فەرهەنگی مەهاباد )یش . لەناو ئەمانەشدا کەڵکم لە ( برهان قاطــع ) و ( فرهنگ عمید ) لــەوانیکەیان زیاتر وەرگرتوە .

★ ★ ★

( شێرین و خوســرەو )ی ( خانای قوبادێ ) ، وەك لــە خوێندنەوەی تێکستەکەیەوە بــۆ هەر ( گۆرانێ ) زانێك دەرئــەکەوێ ، تەنهــا چیرۆکێکی دڵــدارێی شێــرین و خوســـرەو و کارەســاتی فەرهــاد و ســـەرەنجامی تراژێدیایێیان و خۆ تێهەڵقورتاندنی پڕ لەنەگبەتێی شێرۆیەی کوڕی خوسرەو نیە لــە ژیــانی باوکیا . بــەر لە هــەرچی شاکارێــکی ئەدەبییــە لە شــێوەی داستانێکا . ئــەوەی فارسێ و گــۆرانێ بــزانێ و بەراوردێــکی خوسرەو و شێرینەکەی شاعیری بەناوبانگی بە دایك کورد* و بە باوك ئاذەربایجانێ و بە زمانی ئەدەب فارسێ : ( نیظامێ گەنجەوێ ) بکا لەگەڵ ئەم کارەی شاعیرێکی ناو و نیشان کــورد کردوێەتی کــە بەداخەوە هــەر ئەوەندەی لــێ ئەزانێن پێیئەڵێن ( خانای قوبــادێ ) ، یاخود وەك خۆی لە شوێنێــکی کتێبەکەیا بە خۆی ئەڵێ ( خانای خان قوباد ) ، بۆی دەرئەکەوێ کارەکەی نیظامێ گەنجەوێ لە چاو کارەکەی ئەمــا وەك ئەسکالێتێــك دێتە پێش چاو خانــا بە پێشـاندانی دیمەنی جوان و وەصفی ورد و دەربڕ و ڕەوانبێژیانەی گۆشت و دەمار و پێستی پێ پۆشێبێ و خوێــنی تێزاندبێ و گیانی کــردبێ بە بــەرا ، لەگەڵ ئەوەشدا کە کارەکەی خانا ( ٥٥٢٦ ) بەیت و هینەکەی نیظامێ « بەگوێرەی

---

* نیظامێ گەنجەوێ لە ( لەیلا و مەجنوون )ەکەیدا وا باسی دایکی ئەکا :

**گر مــادر من رئیســهء کرد ،**
**مادر صفتانه پیش من مــرد ،**
**از لابــەگری کــرا کنـم یاد ،**
**تا پیش من آردش به فریــاد ؟**

واتە ئەگەر دایکی من کە سەرۆکی کورد بو ( یا ناوی « رئیسـة » بو و کورد بو ) دایك ئاسایێ بەر لە من ، یا لە بەردەمی مــنا ، مرد ، من لە کوڕۆزانەوەی خۆما هاوارە کێ بکەم تا بێ بە هاوارمەوە و بیهێنێتە لام ؟

چاپی ۱۹٦۰ی ئەکادێمیی ئاذەربایجان لە باکۆ » ( ٦۱۸۸ ) بەیتە و بەو پێیە ئەبۆ ئەمی نیظامیی بالآتر بوایە چونکە قەوارەی ڕازەکە لای هەردوکیان تێکڕا وەك یەکە .

زۆر بە ئاواتەوە بۆم بـۆم بلوایە بەیت بەیتی ئەم شێـرین و خوسرەوە نازارەم لێك بدایەتـەوە تا بۆ هەمـو کورد زمانێـك وەك بۆ ئەوانە بـوایە کە زاراوەی گۆرانیی ئەزانن . بەڵام بەداخەوە کارێکیوا کاتێکی زۆری ئەوێست و وەك وتم لەچاپدانیشی دارایەکی زۆری پێویست ئەکـرد و هێچیشیان لە دەسەڵاتا نەبو . بۆیە ئەمەی کـە ئیستا ئەیخەمە بەردەسـتی خوێندەوارانی کورد ، ئەگەر بمانەوێ بێ زیادە ڕەوێ بدوێین ، تەنهـا تێکسـتی لێكدراو و بەراورد کراوی دۆ نوسخەی جیا جیای شێرین و خوسـرەوە لەگەڵ نێمچە هەڵاوێردنێکی یەکێکیان لە هەندێ شوێنا و ئەویان لە هەندێ شوێنیتردا و هەوڵێکی سەرەتایی ڕاسـت کردنەوەی بەشی زۆری وشـە نەزانراوەکانی . دیارە مەبەستم ئەوە نیـە کارەکەی خۆم لە بـەردەمی خەڵکدا بە کەم پێشان بدەم . ڕاستەکەی ئەوەی من کردۆمە ئەوەتە تێکستێکم خستوەتە بەردەستی خوێنـدەواری کوردو کـاری لێکۆڵـەرەوەی دوارۆژم ئاسـانتر کـردوە و فەرهەنگۆکێکی پتـر لە ( ۳۲۰۰ ) وشـەیێ بەشـی هـەرە زۆر ــ گۆرانـیم لەم شێرین و خوسرەوە دەرهێناوە . جا ئەگەر هەر خۆم بۆم لوا جارێکیکە بەسەر کارەکەی خۆمدا بێمـەوە و پوختتری بکەم ئەوە ئـارەزوی دڵمە و ، ئەگینا بێگومان ڕۆژێـك دێ نەك هەر ئـەم تێکستە ، هەمـو پاشماوەیەکی ئەدەبیی نەتەوەکەمان بخـرێتە بەر تیشکی لێکدانەوە و لێکۆڵینـەوە و وەك پاشماوەی ئەدەبیی گەلانیکە ئامادە بکرێن و کۆڕی ئەدەبیان پێ بڕازێنرێتەوە.



بەداخەوە ئێمە مێژۆی ژیانی ( خانا ) نازانین تا تێبگەین ئاخۆ یەکێ بوە لە مەلا پایە بڵندەکانی کوردستان ، یا هەر یەکێك بوە لەوانەی پێیان ئـەوترا ( میرزا ) و چێژێـکی شیعر و ئەدەبیان هەبـو و بە هێزی خۆیـان توانایەکی ڕۆشنبیریـیان بۆ خۆیان پێكئەهێنـا و هەر لـەم ڕێگایەوە هێوایـان تیا هەڵئەکەوت ئەبۆ بە سەرامەدی دەوری خۆی . بۆیە ئەبێ بۆ زاڵ کردنی تیشکی ئاگاداریی بەسەر کەسایەتیی خانادا ، تا ئەو ڕۆژەی شتێکی باوەڕ پێکراوی بەش کردۆمان لەبارەیەوە بۆ دەرئەکەوێ ، پەنا هەر بەرێنە بەر بەرهەمەکانی خۆی کە تائیستا لـەم شێرین و خوسـرەوە و لە چەنـد پارچە شـیعرێکی بەولاوەمان لەدەستا نیە .

لەو شیعرانەی خانا کە بۆ ئێمە ماونەتەوە ( حەوت بەند )ەکەی نیشانەی ئەوەن کە هەم مەلایەکی ئاگـادار بوە و هەم پیاوێکی دڵ دڕدۆنـگیش بوە . مەسەلەی ( جەبر و ئیختیار ) واتە ئاخۆ بنیادەم خۆی دروستکەری کاری خۆیەتی وەك موعـتەزیلەکان ئەڵێـن ، یاخود خـوا بە زۆر پێـی ئەکا وەك جەبریەکان ئەڵێن ، یا نیمچە دەسەڵاتێکی کەم یا زۆری هەیە وەك بەشەکانی ئەهلی سوننەت ئەڵێن ، مەسەلەیەکە نەك تەنها بیری خاوەن بیرانی پێشەوەی ئیسلام ، بەڵکو تێکڕای فەلسەفەی ئایدیایی خەریك کردوە . لەناو ئەوانـەدا کە لە سەدەکانی تاریکایی داهاتنی بیری ئیسلامدا ئازایانە مەشخەڵی بـیری ئازادیان هەڵگرتوە و ڕێگای پرس و توێژینەوە و گومانیان گرتـوەتە بەر خانا لوتکەیەکی ڕۆشنە . لەو ( حەوت بەندە )یدا هەرچەند ناتوانی دەس بە هەمو شتێکەوە بنی ، جـێ پەنجەی خـۆی بە ژیانی بیریی جیـهانی ئیسلامەوە بەجێهێشتوە . ئێـرە جێگەی لێکۆڵینـەوەی ئەم بابەتە نیە و بـا بمێنێ بۆ شوێنی خۆی . من لەم نمونە هێنانەوە تەنها ئەوەندەم مەبەست بو بـگەمە ئەو ئەنجامە کە خانا ( کوڵکە خوێندەوار ) نەبوە ، ئەگینا پەنجەی نەئەخستە بابەتیوا قورس و پڕ مەترسییەوە .

نەك تەنها حەوت بەندەکەی، خۆش بەختانە ئەم شیرین و خوسرەوەشی لەبارەی ڕۆن کردنەوەی پایەی زانستیی خاناوە بابەتێکی هەژار و بێ دەرامەت نیە ، گەلێ شتی لێ هەڵئەکرێنرێ . بۆیە من لێرەدا وردە وردە ئیشـارەت بە هەندێ بابـەت ئەکەم کـە لە خوێندنـەوەی تێکستی کتێبـەکەوە دێـنە بەردەستی خوێندەوار و بەگوێرەی توانـا و پێویستیی شوێـن لەسەریان ئەنوسم .

لە چوار چێوەی ئەو پـەراوێزە ئەدەبییەدا کە خانـا بۆ تێکستی ڕازی ڕوداوەکانی شیـرین و خوسرەو و فەرهاد و شیـرۆیە و دەس و پێوەندی دەربار و کۆڕی جەنگ و ڕاوێژ و ڕابواردنی ئەمانەی کردوە ، گەلێ بابـەتی وامان دێتە ڕێ باری تێگەیشتن و بیر و باوەڕی خانامان لەبارەی گەلێ ڕوی ژیانەوە بۆ دەرئـەخەن . ئـەوەی ئەم داستـانە ئەخـوێنێتەوە لـە هەستی شانازیی خانا بە خۆی ، بە کورد ، بە کوردستان ئاگادار ئەبێ .. بە باوەڕی لەبارەی سـتەم و داد پـەروەریی و جۆری حوکمـڕانی و ڕژێمی کۆمەڵایەتی ئاشنا ئەبێ .. هەڵوێستی دەربارەی ئافرەت و خۆشەویستی و بەسەربردنی ژیان و گەلێ بابەتیتریشەوە بۆ دەرئەکەوێ .. شارەزای گەلێ سەری ژیانی ناوەوەی دەرباری حوکمڕانان و پیلان گێڕانیان و پەیوەندی ڕاستـەقینەی حوکمڕانان و کاربەدەستانی بەردەسـتیان و جـۆری بیر کردنـەوەی چینی

حوکمڕان ئەبێ .. لە فۆلکلۆری جەنگ و ڕاو و ڕابواردن و شایی و شیوەن و گەلێ سەری‌تری ژیانی چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵی کۆنی کوردەواری شارەزا ئەبێ .. بەڵێ ڕاستە خانا کە لەم باسانە ئەدوێ باسی سەردەمێکی تایبەتی و کەسانێکی تایبەتی ئەکا بەئاسانی نابەسرێنەوە بە کوردستان و کۆمەڵگای کوردەوە . بەڵام من وای بۆ ئەچم خانا بۆ دروست کردن و خستنە قالبی ڕووداو کەرەستەی لە ژیانی سەردەمی خۆی وەرگرتوە یاخود بە واتایەکی‌تر بیلێین ژیانی بیری و کۆمەلایەتی‌ی کوردستانی دەوروبەری خۆی لە سەردەمی خۆیا لە چوار چێوەی ڕازی خۆشەویستی‌ی شیرین و خوسرەودا خستوەتە ڕوو . ئەوە زۆر ئاسانتر و عەقڵ گرتوترە ڕووداوەکە بخەیتە چوار چێوەی ژیانی سەردەمی خۆتەوە تا بڕۆی لەنێو پەڕەی کتێبە کۆنا باسی سەردەمی ڕابوردوو و جۆری ژیانی ئەو سەردەمە بدۆزیتەوە و ڕووداوەکەی لێ بئاڵێنی ، ئەمە ئەگەر بابەتی‌واش لەنێو پەڕەی کتێبە کۆنا دەسگیر ببێ .. ئەمە ڕاستییەکە بە درۆدا ناخرێتەوە و بۆیە ئەو شتانەی خانا لەم بابەتانەوە باسیان ئەکا نرخێکی تایبەتییان هەیە بۆ پەردە هەڵماڵین لە ڕووی ژیانی کۆمەلایەتی‌ی ئەو سەردەمەی ئەو ناوچانەی کوردستان کە خانا تیایانا ژیاوە و شارەزایان بوە و تێکڕا کوردستانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتی باشوور ئەگرێتەوە .

خانا هەرچەند لە سەردەم و شوێنێکی پێشکەوتوودا نەژیاوە گەوهەری بەهرەوەری و لێهاتنی تیا تێشك بداتەوە ، خۆی ، خۆی باش ناسیوە و لە تاقی کردنەوەی ژیان ئەوەندەش حاڵی بوە کەوا پیاوی بەهرەمەند هەمیشە لەژێر خۆڵی پێ‌نەزانینا نامێنێتەوە . لەگەڵ ئەوەشدا کە زیاتر لە جاری بە شان و باڵی ( نیظامی )یدا هەڵداوە ، خۆی لەو بە کەمتر دانەناوە . بە خۆی ئەڵێ بێتە مەیدانی کارەوە و بەرهەمێکی وەك بەرهەمەکەی نیظامی شایان بخاتە بەردەست تا خەڵکیش بیناسن و بازاڕی ڕەواج پەیدا بکا و لای‌وایە بێ کارێکی‌وا عومری بە زایە ئەڕوا . تەنانەت وایش پێشان ئەدا ئەم ئەرکەی لە غەیبەوە خراوەتە ئەستۆ و نوسینی شیرین و خوسرەوەکەی بە گوێڕایەڵی‌ی فەرمانی سرۆش دائەنێ :

**ئەو ڕۆ کە خامەی عەنبەر شەمامە**
**وەش بۆ کەرد جە موشك ئینشای ئەی نامە**

**تەئریخ هیجرەت ( ختم المرسلین )**
**موطیع دیوان شەرح شەرع و دین**

**ڕۆی دۆشەممە بی ( ذی حجة الحرام )**
**هەزار و پەنجا و یەکصەد سێ تەمام**

ناگا جه وەختێ مێنای صوبح دەم
جه جام خورشێد ڕەوشەن بێ چون چەم

جه پەردەی ئەسرار لامەکان ماوا
سرۆشێ بەی طەور بەگۆشم یاوا

واتێ : هەی شوعەرای خۆش نەظم و شێوە
جانشێن قەیس پەی لەیلا لێوە

چێش مبۆ چون نەظم ( نیظامێ )ی دوڕ سەنج
به لەفظ شێرێن به بێ لاره و لەنج

جه وەصف فەرهاد شێرێن و پەروێز
باوەری به ڕەقص خامەی عەنبەرێز

عەیبەن پەرێ تۆ دانای دوڕ شناس
دەمێ چون صەڕڕاف یاقوت و ئەلماس

جەی بازار عەشق جه ڕای پڕ هۆشێ
مەشغوڵ بی به کار جەوهەر فرۆشێ

حەیفەن وێنەی تۆ جەواهیر بارێ
نەکەرۆ پەی وێش ڕەنگێن بازارێ

خاطرت جەم بۆ جەوهەرێی لاڵ سەنج
دانای دوڕ شناس ، گەنجوور کۆی گەنج

هەرکەس وێنەی تۆ گەوهەر بارشەن
دانا و بزورگان خڕێدارشەن

گوشاد کەر زوبان جەواهیر بارت
تا گەرم بۆ ظەرێف سەودای بازارت

وەر نه جه دەوران تۆ جه بێ کارێ
عومرێ به زایە و به پۆش مویارێ

ئەم ئەرکەش لە هەستێکی خاوێنی نەتەوە پەروەرێ و شانازێ کردن بە کورد و کوردستانەوە ئەخاتە ئەستۆی خۆی و ئەڵێ هەرچەند فارسێ زمانێکی وەك شەکر شێرینە ، کوردێش لە فارسێ شێرین‌ترە و پێویستە لەم دنیای بەد ڕەفتارەدا ( کە تا ئیستا ڕێی بەکارهێنانی زمانی خۆمانی لێ

گرتوین ) هەرکەس ئەو زمانەی خۆی بەکار بێنێ کـە خوا پێی‌داوە و کەواتە ئەبێ ئـەم ڕازی شـیـرینی شـیـرین و خوسرەوەش ، وەك چـۆن نیظامێ هۆنیویەتـەوە ، منیش بیهۆنمەوە و بـە کوردیش بیهۆنمـەوە تـا تێکڕای خەڵکی کوردستان لێی بەهرەمەند ببن :

**یا ڕەب بە فیراق فەرهاد کۆکەن !**
**بە خورشید حوسن شیرین ئەرمەن !**

**بە ئیستیلای عەشق خوسرەو پەرویز !**
**بە خۆش خیرامیی گوڵگۆن و شەبدیز !**

**بە خامەی موشکین شاپوور چینێ !**
**بە ناز شیرین ، بەو نازەنینێ**

**بە ساز و بە لەحن شۆخ نیکیسا !**
**بە نەبیر ئاهەنگ موعجیزەی عیسا !**

**بە طوغیان دەرد بێ دەرمان عەشق !**
**بە طۆفان سەدد ئەسر مەینەت مەشق !**

**وینەی ( نیظامێ ) صەیقەل دەر زەینم ..**
**بە سورمەی دانش ڕەوشەن کەر عەینم ..**

**تا کە ماجەرای شیرین و خوسرەو ،**
**سەنگ تاشیی فەرهاد ، سەرگوزەشت ئەو ،**

**باوەرۆ وە نەظم خاستەر جە گەوهەر**
**بە ڕەشح خامەی شۆخ بۆ عەنبەر**

**ڕاستەن مواچان فارسێ شەکەرەن**
**کوردێ جە فارسێ بەڵ شیرین‌تەرەن**

**پەی چێش ؟ نە دەوران ئەی دنیای بەدکێش**
**مەحظوظەن هەر کەس بە زوبان ویش ..**

**مەعلومەن هەر کەس بە هەر زوبانێ ،**
**بواچۆ نەظمێ جە هەر مەکانێ ،**

**وینەی عورووسان زیبای موشك چین ،**
**بکەرۆش جە حوسن عیبارەت شیرین ،**

خاریج جه مەعنێ نمبۆ مەضمۆنش ،
کریابۆ چون شیعر ( جامێ ) مەوزۆنش ،

جه لای خیرەدمەند دڵ پەسەند مبۆ ..
شێرین‌تەر جه شەهد شێرەی قەند مبۆ ..

جه عەرصەی دنیای دۆن بەد فەرجام ،
بە دەستور نەظم ( نیظامێ ) تەمام ،

بە لەفظ کوردێ ، کوردستان تەمام*
پێش بوان مەحظوظ ، باقێ ( والسلام ) ...

خانا لە تاقێ کردنەوەی ژیانی خۆیەوە گەیشتوەتە ئەو ئەنجامە کە ڕژێمی ستەم دنیا بەڕێوە ئەبا و جیهان داد پەروەریێ تیا نیە :

خانا ، بۆ ، وەسەن زوبان درازێ ..
کۆن ئەو صاحێب عەدڵ تۆ پێش بنازی ؟ !

کۆتا کەر ئەی حەرف بە دەوان دەو
وێر دەر بە فرمان دڵگێر خوسرەو ..

هەستێکی قوڵی نارەزایێ لە جەور و ستەم و عەوداڵییەکی بەسۆزی بەدوای داد پەروەریێدا تیا بوە ، ژیانی خۆشی لە داد پەروەریێ ڕژێمی کۆمەڵایەتییەوە ناسیوە :

جه گەرمێی ئافتاو عەدڵ و ئینصافش ،
جه بەرق شمشێر خارا شکافش ،

گورگ و مێش جه عەدڵ ئەو جەمێن چون شەم
صێغەی ئیخوانێ وەندشان وە هەم ..

---

* لاموایە لەمەوە دەرئەکەوێ کەوا تا ئەو سەردەمەش خانا ئەم کتێبەی نوسیوە ، شێوەی ( گورانێ ) زمانی ئەدەبیێ یەکگرتوی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوە ، چونکە خانا ڕازەکەی بەم زاراوەیە هۆنیوەتەوە . بۆیە من لێرەدا ( کوردستان تەمام )ەکەی خانا ئەخەمە تەنها چوار چێوەی کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە چونکە لە باکور و ڕۆژاوای کوردستانی گەورەدا لەو سەردەمەدا زمانێکی ئەدەبیێ‌تر بوە کە کرمانجیێ سەرووە .

**به شاهێش مەردوم بەو طەور بێن خورسەند ،**
**بە عەدڵ و دادش موەردن سەوگەند ..**

**سەنگ دڵەی سەخت ظاڵمان شوم ،**
**نەرم بێ جە قورص ئوستورلاب مۆم ..**

**زەراعەت جە نور ئەو زولف بۆ عەنبەر**
**یەك بە صەد مكەرد ، بەڵكە زیادتەر ..**

تەنانەت لای وابوە سەنگ و تەرازوی هەڵسەنگاندنی خەڵك لای خواش داد پەروەری و نا دادپەروەرییە و داد پەروەری بە بەهەشتی زانیوە ئەگەرچی كافریش بێ :

**مەعلوم بۆ جە لای بزورگان دەور :**
**هەر كەس عادڵ بۆ چون هورمز بەی طەور**

**بەرگوزیدەی ذات حەیی ئەكبەرەن ..**
**مەحفوظەن جە نار ئەر صەد كافرەن ..**

ئەڵێ ئەگەر پاشا دادپەروەر بێ ، واتە ئەگەر ڕژێمی كۆمەڵایەتی ڕژێمێ بێ بۆ سودی كۆمەڵانی خەڵك ، زەوی ئەبێ بە عەنبەری بۆن خۆش و ، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر پادشا ستەمكار و بەد بێ و بیر لە سودی گشتی نەكاتەوە وڵات وێران ئەبێ و خەڵك حەسانەوە بە چاوی خۆیان نابینن :

**بەڵێ جە خانای عەطارید خامە ،**
**مونشیی وەصف زولف عەنبەر شەمامە ،**

**بە سەمع شەریف بشنەو حیكایەت :**
**ئەر قەصدش خێرەن والیی ویلایەت ،**

**بە جای گوڵ زەمین ماوەرۆ گەوهەر ..**
**سەنگ مبۆ بە لاڵ ، خاكش بە عەنبەر ..**

**ئەر والی بێ عەدڵ ، شەرارەت پیشەن ،**
**بەد جینس ، بەد كار ، دور جە ئەندیشەن ،**

**ولگەی مەملەكەت كەی مەعمور مبۆ ؟**
**ئەیمەنی و ڕاحەت جە خەڵق دور مبۆ ..**

بە پێویستی سەرشانی پادشاهانی دائەنێ كە دادپەروەر بن و لەگەڵ

نۆکەر و لەشکری خۆیانـا بگونجێن و دڵی خەڵکی شـاد کەن و ئەمێن نەبن لەوە کە جارێك دوعـای ستەمدیدەیەکیان لێ بکەوێـتە کار تاج و تەختیان بشێوێنێ :

**واتش : ئەی خوسرەو ، دانای خیرەدمەند ،**
**وێنەی بابای وێت چێش مبۆ یەك چەند**

**چەنێ سوپاهێ و نۆکەر بسازی ؟**
**بتەرسی جە مەرگ ، مەظلۆم بنوازی ؟**

**دەمێ هەم بە عەدڵ مسکینان کەر شاد !**
**مەملەکەت بە عەدڵ دادت کەر ئاباد !**

**حەذەر کەر جە چەنگ سەرهەنگ ئەجەل**
**فەلای زیندەگیت بکەرۆ قەبەل ..**

**خۆف کەرە ، خوسرەو ، صوبحێ یا ئێوار**
**دوعای مەظلۆمێ لێت بگنۆ بە کار ...**

شێوەی ڕاسـتی چارکردنی گێر و گرفت و بڕیـار دانیشی بە پرس و ڕاوێژ زانیوە و لای وا بوە تەنها لێکۆڵینەوە و ڕاوێژ بە یـەك کردنی کۆمەڵ ئەتوانێ کار مەیـسـەر بکا و بیری تاقە کەس ، با ئـەو کەسەش زۆر وریا و خاوەن بیر بێ نامانگەیەنێتە ئەنجام :

**بەڵێ دەستوورەن نە عەرصەی دەوران :**
**وەختێ کار سەخت ڕۆ دۆ نە ئینسان ،**

**ئەر چون ئەفلاطوون مۆ شکاو مبۆ ،**
**فرێ پێش خەرێك هەم خەرکاو مبۆ ..**

**خوسرەو کەرد بە هۆش ڕەوشەنێی ضەمیر**
**ئەی کارە بە دەست ڕوجۆع تەدبیر**

**پەی چێش ؟ مواچان : یە پەند پیرەن**
**تەحلیل موشکوڵ هەر بە تەدبیرەن ..**

خانا ، وەك لە تێکستی شیرین و خوسرەوەکەیەوە پتر لە جارێ دیاری ئەدا ، لە مەیدانی مۆسیقادا شارەزایێ بوە . بۆ نمونە لە چەند شوێنا ناوی پەردەکانی مۆسیقا ئەهێنێ و وایشیان باس ناکا کە تەنها لە ( نیظامی )یەوەی

وەرگێڕابێتە سەر کوردیێ . لەم شیرین و خوسرەوەدا ناوی پەردەی (عێراقیێ) و (حیجاز) و (بزورگ شەهناز) و (گەنج باد ئاوەرد) و (گاو گەنج) و (گەنج سۆختە) و (شادڕەوان مرواریێ) و (تەخت طاقدیسیێ) و (ناقوس) و (حوققەی کاوس) و (موشك دانە) و (ئارایش خورشید) و (نێمە ڕۆز) و (قوفل ڕۆمیێ) و (سەروستان) و (سەرو سەهیێ) و (نۆشین بادە) و (ساز نەورۆز) و (موشك مالیێ) و (دلارای شەودێز) و (شەب فەڕڕوخ) و (ڕۆز فەڕڕوخ) و (غونچەی کەبك دوریێ) و (نەخچیرەگان) و (کین سیاوش) و (کین ئیرەج) و (باغ شیرین) و (نەورۆز) و (عوششاق) و (ماهۆر) و (مەغلوب) و هیتریش بەرچاو ئەکەوێ کە زۆربەیان وەك بە ناوەکانیانا دەرئەکەوێ (مۆسیقای تەصویریێ)ن . هەروەها خانا ناوی گەلیێ لە ئامرازەکانی مۆسیقاش ئەهێنیێ وەك (ساز) و (چەنگ) و (نەی) و (دەف) و (عود) و (سەمتور) و هیتکە .

بە درێژیش لە گەلیێ موناسەبەتی باسی ئەستێرە گرتنەوەدا بۆ زانینی بەختەوەریێ یا نەگبەتیێ ، شارەزاییێ خۆی لە زانستی ئاسمان شوناسیێ پێشان ئەدا و ناوی (زیج) و (ئوستورلاب) و ئەستێرەکان و بورجەکانی ئاسمان دێنیێ ، هەر یەك لە جێی خۆیاندا و بەجۆرێك کە نیشانەی ئەوە بیێ لە گوترە قسە ناکا .

هەروەها لە خوێندنەوەی ئەم شیرین و خوسرەوەوە ئەگەینە ئەوە کە خانا شارەزاییێ لە زانستی ئابوریشدا هەبوە . قسە لە قانونی (پێشان و داوا ـ العرض والطلب) ئەکا و ئەلیێ :

**پەی چێش ؟ کە دنیا یە بازارشەن**
**هەر جینسیێ دوێ کەس خرێدارشەن**

**بەی طەورەن دەستور جە لای سەوداگەر**
**بەهای ئەو جینسە مبۆ گرانتەر**

تەنانەت هەلگرتنی کەل و پەلیشی بە نیازی فرۆشتنی لە دوارۆژا بە گرانتر بە کارێکی سودمەند نەزانیوە لەبارەی ئابورییەوە و لای وا بوە ئابوریێ فامی ڕاستەقینە مادەم کەل و پەلەکەی ڕەواجی بیێ زوێ ئەیفرۆشیێ و لای خۆی ڕاگیری ناکا و ئەو فرۆشتنەی و خستنەوە کاری پارەکەی بۆ کڕین و فرۆشتنی کەل و پەلی نوێ قازانجی زیاترە بە بەراورد لەگەڵ هەلگرتنیا بۆ ماوەیەك کە بنیادەم خۆی نازانیێ زۆر ئەخایەنیێ یا کەم ئەخایەنیێ ، بە نیازی فرۆشتنی بە گران و ئاخۆ پاشان ئەو پارەیە ئەکا کە ئەو مەبەستیەتی یا نە :

**بەڵێ جە لای ئەهل دانای دیاری**
**خاس نیەن کەرۆ کەس تیز بازاری**

**مەتای هەرکەسێ خرێدارشەن**
**ئەر زۆ بۆەرشۆ صەرفەی کارشەن**

**دەولەمەند ئەوەن کاڵای ویش دایم**
**چون ڕەواجش بۆ نەکەرۆش قایم**

لە شیرین و خوسرەوی خاناوە دیاری ئەدا خانا خۆیشی دڵدار بوە . لەویادا کە باسی هۆیەکانی دانانی کتێبەکەی ئەکا ، ئەڵێ :

**واتن : هەی شوعەرای خۆش نەظم و شێوە !**
**جانشێن قەیس پەی لەیلا لێوە !**

کەواتە وا خانا خۆی کرد بـە جێنشـینی مەجنون و خۆی بە شێتی لەیلایەك دایە قەڵەم . لە ڕاستیدا سـەرەڕای ئەم پێ لێنانەی خانا خۆیشی زۆر دۆرە شاعیرێ بتوانێ ڕازی دڵدارییەك وا بەسـۆزەوە بنوسێ ئەگەر لە تاقێ کردنەوەی ژیانی خۆی و ژانی تایبەتێی خۆیەوە کەرەستەی ڕازاندنەوەی کارەکەی وەرنـەگرێ . توانـایوا هەرگیز لە ئاگادارییەکی ( نەظـەری )ی خۆشەویستییەوە بۆ کەس مەیسـەر نابێ . ئەوەی خانا دەریئەبڕێ ئەنجامی ئاگرێکی بەتینی عەشقە بەربوەتە دڵی و کارێکی لێ کردوە بڵێ :

**بەڵێ ، زۆر عەشق ضەرب پەنجەی فەرد**
**سەدد ئەسکەندەر مکەرۆ بە گەرد**

**بەرق شۆڵەی عەشق نە ڕۆی عەرصەی دەور**
**بگنۆ بە هەرکەس چون ترێشقەی هەور**

**تا ظوهور سەخت ڕۆی ( یوم القرار )**
**مکەرۆش وە پەند واتەی ڕۆژگار ..**

**سۆد سەودای عەشق دایم گریانەن ..**
**قنیاتش هەر زۆخ جەرگ بوریانەن ..**

**شەڵڵا کەس سەرسام سەودای عەشق نەبۆ !**
**منەت زەدەی دەرد مەجنون مەشق نەبۆ !**

بەڵام صەد داخ و صەد مخابن .. کڵاو ڕۆژنەیەك نیە لێیەوە بڕوانینە

مێژوی ڕابوردو بزانین ئەم لەیلای خانایە چۆن کچە کوردێك بوە .. ئاخۆ دڵی بەخشیوە بەم مەجنونە دڵسۆزەی ، یان ئەوینی ژمارەیەکیتری خستوەتە سەر دەفتەری شەهیدانی لە ژمارە نەهاتوی دەردی عەشق ؟!



ئەگەر بە وردی لەم شیرین و خوسرەوەی خانای قوبادی بکۆڵینەوە گەلێ داب و نەریتی کۆنی کوردەواریمان بۆ ڕون ئەبێتەوە کە مەگەر هەر لەم جۆرە بەڵگانەدا خرابنە سەر کاغەز و سەرچاوەیەکی نوسراوی تایبەتییان نیە . بۆ نمونە لە باسی لەدایکبونی خوسرەودا ( ل ٢١ ــ ٢٣ ) چۆنیەتیی بێشکە دروستکردن و ڕازاندنەوەی و بەشەکانی ئەو پۆشەمەنییانەی لە بێشکەدا بەکار هێنراون و ئەو جل و بەرگانەی کراونەتە بەری خوسرەوی منداڵ (یا هەر منداڵێکی کەی چینی سەرەوەی کۆمەڵ) هەمو ڕون کراونەتەوە .

لە باسی جەنگی خوسرەو و بارامی چۆبینا ( ل ٢٥١ ــ ٢٥٦ ) بە درێژی باسی لەشکر ئارایی و ئەو جۆرە چەکانەی هەردولا بەکاریان هێناوە و جۆری بە ڕوی یەکا هەڵشاخانیان لە شێوەیەکی ڕەوان بێژییانەی ڕازاوەدا ڕون کراوەتەوە .

لە باسی ئەنجومەن گرتنی خوسرەوا ، پاش بەزینی بارام چۆبین و بیستنی هەواڵی مردنی ( ل ٢٨٩ ــ ٣٠٠ ) ، خانا بە درێژی جۆری بیر و باوەڕی پادشاهانی ئەو سەردەمە و ئایدیای حوکمڕانییان و هەڵوێستیان بەرابەر بەردەستیان پێشان ئەدا و نمونەی بیر و باوەڕیان ئەخاتە ڕو کە چۆن مێشکی خەڵکیان سڕ ئەکرد و کارێکیان ئەکرد کەس بیر لە بەربەرەکانێیان نەکاتەوە . لە باسی پیلان نانەوەی شێرۆیەیشدا بۆ کوشتنی باوکی و قایل کردنی پاسەوانەکانی و بێدەنگ کردنیان و پاشانیش سەر شۆڕ کردنی کاربەدەستە گەورەکانی دەوڵەت ( ل ٦٦٩ ــ ٦٨١ ) نمونەیەکی ئەو حوکمڕانییانەمان دێتەوە پێش چاو کە لەسەر بناغەی سودی کۆمەڵ و وەفاداری بۆ ئایدیایەکی بەرز و پاك دانەمەزراون و پارێزگارەکانیان هەر کە لە سودی تایبەتیی خۆیان بێگومان بون و متمانەیان کرد توشی هیچ زیانێك نایەن ، زو دەستیان لێ ئەشۆنەوە و پشتیان ئەدەن بە زەویدا . هەروەها لەبەرئەوەش کە ئاشکرایە خانا یا هەر شاعیر و نوسەرێکیتر بۆ تۆمار کردنی ئەم جۆرە بابەتانە ، وەك وتمان ، زیاتر کەڵك لە باری هاوچەشنی دەور و چەرخی خۆی وەرئەگرێ تا لە کتێبی کۆن ، ئەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامە کەوا ئەوەی خانا ئەیگێڕێتەوە و ئەیداتە پاڵ خوسرەو وێنەیەکی ژیانی چینی

سەرەوەی سەردەمی خۆشیەتی. ئەمەش ، بە تێ‌گەیشتنی من ، بۆ لێکدانەوەی مێژۆی کۆمەڵایەتیمان ڕۆناکییەکی باش و کەرەستەیەکی بەکەڵکە ، نەخوازەڵا کە ئێمەی کورد مێژۆمان لە گەلێ ڕوەوە بوە بە باخی بێ باخەوان و بەرهەمی کۆنەکراوەتەوە .

هەر لەو بابەتانەی ئەتوانین وەك کەرەستەیەکی فۆلکلۆریێ کەڵکێکی باشیان لێ وەرگرین و خانا لەم کتێبەیدا جێی کردۆنەتەوە ، باسی لاواندنەوەی خوسرەوە لەلایەن شیرینەوە ( ل ٧٠٦ ــ ٧٠٩ ) و باسی شتن و کفن کردنی ( ل ٧١٠ ــ ٧١١ ) و گۆڕ بۆ هەڵکەندنی ( ل ٧١٣ ــ ٧١٤ ) وجل و بەرگی ئازیەت‌باریێ لەبەرکردنی شیرین ( ل ٧١٤ ــ ٧١٥ ) و باسی چۆنە گەرماوی و شتنی لەلایەن کەنیزەکەکانیەوە ( ل ٧٤٩ ــ ٧٥١ ) و خشڵ و قوماشی جل و بەرگی ژنانە و خۆ ئارایشت دانی ژنان ( ل ٧٥١ ــ ٧٥٦ ) . ئەمانە هەمۆ شایانی ئەوەن بکرێن بە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی لێکۆڵینەوەی ژیانی ئەتنۆگرافیایێی کورد و گەلێ کەرەستەی بەنرخیان لێ دەربهێنرێ . سەرەڕای ئەوەش کەوا ئەم هەمۆ جۆرە جل و بەرگ و بۆن خۆشێ و کەل‌وپەلی ئارایشت و کەرەستەی جەنگ و ڕاو و ڕابواردن و خواردنەوە و خواردن و ئەم هەمۆ ڕەنگانەی کە خانا ناویان ئەهێنێ (ل١٨٧ و هەندێ شوێنیتر ) نیشانەی پلەیەکی پێشکەوتوی شارستانەتین کە کوردستانی ئەو دەمەی پێ گەیشتبو .



خەباتی شیرین بۆ پاراستنی مایەی سەربەرزیێی خۆی و خۆ بە دەستەوە نەدانی و نەبۆنی بە هۆیەکی ڕابواردنی خوسرەو وبەرگریێ کردنی لە مافی خۆی لە پێکهێنانی ژیانێکی خاوێنی ژن و مێردێدا ، لەگەڵ ئەو هەمۆ تەقەلایەشدا کە خوسرەو دای بۆ ئەوەی بێ مارە بڕێن دەستی بەسەرا بگرێ ، کە بەشێکی زۆری کتێبەکەی گرتوەتەوە ، هەروەها خۆ بە کوشت دانی لەپێناوی وەفا و پارێزگاریێی ڕۆسۆریێی خۆیا کە ئەمیش هەر لە سەرەنجامی شیرینەوە دیاری ئەدا ، لەلایەکەوە ئامۆژگاریەکی بەسۆدە بۆ ئافرەتان کە لە جیهانێکا ئەوان خاوەنی هیچ نین تیایا و پیاو خاوەنی هەمۆ شتێکە ، ئاگاداری خۆیان بن و بە قسەی لۆس پێیان هەڵنەخلیسکێ . لە لایەکی‌کەشەوە نمۆنەی شیری پاکی ئافرەت و بیری ورد و خاوێنیەتی نەخوازەڵا ئەگەر بەراوردی لەگەڵ هەڵوێستی خوسرەو و شیرۆیەی کوڕی بکەین .



پێلان نانەوەی شیرینیش بۆ ژار دەرخواردانی مریەمی ژنی خوسرەو و کۆسپ هەلگرتن لەڕێی خۆیدا ( ل ـ ٤٢٤ ) و تەگبیر کردنی خوسرەو و پیاو ماقوڵانی بۆ لێبونەوە لە فەرهادی دلدار (ل ـ ٣٩٩) و کوشتنی خوسرەو لەلایەن شێروّیەی کوڕیەوە کە تەماعی کردبوە شیرینی باوەژنی خۆی لەگەل ئەوەشدا کە دیارە لەچاو شیریندا زۆر منال بوە ، چونکە لە ڕازەکەوە وا دەرئەکەوێ کە خوسرەو بەر لە شیرین هەر مریەمی هێناوە و ئەبێ شێروّیە کوڕی مریەم بوبێ و ، دەست بە زاخا چۆنی شێروّیە بە تۆلەی شیرین کە هەوەس ڕانیی نازەوا کارێکی پێ کرد بە دەستی خۆی تەخت و تاراجی خۆی لە بن بێنێ ( بەشی دوایێ کتێبەکە ) ، ئەمانەش هەمو نمونەی ژیانی بۆگەنی چینەکانی سەرەوەی کۆمەلی دەرەبەگین خانا دەریان ئەخات بۆمان .



خانا وەك نوسەرێکی ئازاد و لە تانە و ناتورە لێنان نەترساو ، باسی ناسکترین دەمی بەیەكگەیشتنی پیاو و ئافرەتمان بۆ ئەکا و لە شێوەیەکی ڕازاوەی ئەدەبیدا چۆنیەتیی ڕوودانی ئەو کارەمان بۆ ئەگێڕێتەوە ( ل ٤٦٠ ـ ٤٦١ ) و ( ل ـ ٤٦٩ ) و ( ل ـ ٦٣٩ ) . من کە بەراوردی ئەو ڕۆژە و ئیستا ئەکەم کە هێشتا نوسەر ناتوانێ باسێکی کاری جینسی بخاتە چوار چێوەی ڕۆمان یا شیعر یا تەنانەت کتێبێکی ڕۆشنبیریی ڕوتیشەوە بێئەوەی توشی کێشە و سەر ئێشە و ڕێ لێ گرتنی بلاو کردنەوە و بەر دەم کەوتنی خەلکی هەلەوەڕ ببێ ، تێئەگەم خانایەکی لە کوێرە دێیەکی لە ناخی چەرخی دەرەبەگییا ژیاوی ـ کوردستانا چۆن ئازایانە و بێپەروا بابەتێکیوا ناسکی هێناوەتە ئاراوە و زیاتر لە جارێ باسی لێ کردوە .



لەم شیرین و خوسرەوەیدا ، خانا ناسکترین پارچە شیعری بۆ بابەتی دلداری و خۆشەویستی تەرخان کردوە . جوانترین شێوەی ئەدەبیی خۆی بەم مەسەلە نەمرەی مرۆڤایەتی بەخشیوە . هەر لایەکی ئەم کتێبە ئەگری نیشانەی ڕاستیی ئەم قسەیەیە . بۆ نمونە ئەو گفتوگۆ دوور و درێژەی نێوان خوسرەو و فەرهاد ( ل ٣٦٧ ـ ٣٧٠ ) و ، ئەو لەبارەی دلدارییەوە دوانەی نیکیسا و باربود بە زمانی شیرین و خوسرەوەوە ( ل ٥٨٥ ـ ٦١٤ ) و ، ئەو هەمو گفتوگۆی دلدارییەی لەنێوان شیرین و خوسرەو خۆیانا ڕابوردوە و ، ئەو هەمو ڕووداوانەی ڕازەکە گشتی و بەتایبەتی باسی فەرهاد ، کە هەمو نیشانەی هێزی خۆشەویستیی شیرین بۆ خوسرەو و فەرهاد بۆ شیرینن ، لە دنیای شیعری دلداریدا گولی تەوقە سەر و سەر سنگ و یادگاری

هەرگیز کوێر نەبـوەوە و مێژوی هەرگیز نەسـڕراوەن و لە دەفتەری ئەدەبی کوردیشدا هەریەکە شاکارێکن ببڕای ببڕ گەردی زەمانەیان لێ نانیشێ و ڕوی سوریان خۆڵاوێ نابێ .



خۆ ئەگەر وەك کارێکی ئەدەبێی ڕۆت سەیری ئەم پاشماوە گرانبەهایەی خانا بکەین و بە چێژێکی ئەدیبانەوە چاوێك بە هەندێ بابەتیا بگێڕین وەك باسی بـاری دەروونێی فەرهاد لـە کاتی هەڵکەندنی تونێلـەکەی بێستون و نەخشـەکانی قەد تاشە بەردەکانا ( ل ــ ٣٧٧ و پاشـەوەی ) و باسی ناشیرینێی ئەو ئافـرەتەی شـیرین خوسـرەوی سەرخۆشـی ناردبوە سـەر جێگای ( ل ــ ٦٣١ ) و باسی ئەو ئێوارەیەی شێرۆیە خوسرەوی باوکی تیا کوشت ( ل ــ ٦٨١ و پاشەوەی ) و باسی ئاکام هاتنی خوسـرەو ( ٦٨٣ ــ ٦٨٤ ) و خۆ ئامادە کردنی شێرۆیە بۆ کوشتنی باوکی ( ل ٦٨٧ ــ ٦٨٩ ) و کاتێ کـە بەسەر سـەری باوکیەوە وەستابو و هێشتا دەستی تێنەچوبو بێکوژێ و لە کێشەیەکی سەختی دەروونیدا بۆ لەنێوان چاکە و خراپەدا ( ل ٦٨٦ ــ ٦٨٧ و ل ــ ٦٩٣ ) و کوشتنەکەی ( ل ــ ٦٩٦ ) و گریان و لاواندنەوە بەسۆزەکەی شیرین بۆ خوسرەو ( ل ٧٠٦ ــ ٧٠٧ ) و ماڵاوایيە دلگیرەکەی لە کەنیزەکەکانی ( ل ٧٥٩ ــ ٧٦٠ ) و پێشاندانە هونەریەکەی چاوەڕوانێ کردنی خوسرەو لەو دنیادا ( ل ــ ٧٦٠ ) و لاڵانەوەی شیرین لەگەڵ خۆی و وەسفی دوا تاوەکانی ژیانی و شکاتی بە خەیاڵ لای خوسرەو کە شێرۆیە چێی کرد و چێی بەسەر وڵات هێنا و گفتوگۆ خەیالیيەکەی لەگەڵ خوسرەوی نەماو لەبارەی بەهـاری نوێوە و ئەنجا خۆ کوشتنـەکەی ( ل ٧٦٧ ــ ٧٨٢ ) ، بـەڵێ ئەگەر بەچاوی هەڵسـەنگاندنێکی ئەدەبییەوە ئەم بابەتانە بخوێنینەوە بۆمان دەرئەکەوێ خانا چۆن هونەرمەندێ بوە و کارەکەی لە جیهانی ئەدەبدا چ شاکارێکە و مایـەی چۆن شانازییەکە بۆ ئەدەبی کورد .

خانا لەگەڵ گێڕانەوەی هەر کام لە ڕۆداوەکانی ئەم داستانەیدا تابلۆیەکی ڕەنگین دروست ئەکا وەختە بڵێم ڕۆداوەکەی لەناوا ون ئەبێ یا ئەبێ بە چەند پارچەی ورد وردەوە ، هەر کامێکیان شتێکی ئەوتۆی لێ پێك‌نایەت ، بـەڵام لەگەڵ تێکڕای ئەو ڕەنگانەدا کە ئەو بە دەوروبەریا ڕشتویەتی شەبەنگە بـە ڕۆژێك ، پەلکە زێڕینەیەکی پاش بارانی لێ پێك‌دێ بنیادەم هەر حەز ئەکـا سەیری کا چۆن بە ئاسمانی ئەدەبی بەرزەوە خەرمانەی داوە .. ئەمە ، بە لای منەوە ، یەکێـکە لە نیشانە هەرە دیاریيەکانی شیـرین و خوسرەوی خانا ، یەکێکە لەو نیشانانەی کە نیظامی بە قولە پێیشیدا ناگاتەوە تیایاندا .

بۆیە ، ڕۆداوەکانی داستانی شیرین و خوسرەو ، وەك خانا پێشانیان ئەدا ، شایانی ئـەوەن ببن بە کەرەستەی بەردەسـتی تاقمە هونەرمەندێکی بەهرەدار و لێهاتو کۆمەڵە تابلۆیەکیان لەسـەر بکێشن مایەی شانازی بن هەم بۆ ئەدەبی کوردیش و هەم بۆ هونەری جیهانیش .

ئەو هونەرەی خانـا لە کتێبەکەیدا بە گشتی و لەو پارچـانەیدا تۆزێ لەمەو پێش پەنجەم بۆ ڕاکێشـان بەتایبەتی ، دایهێناوە ، شایانی توێژینەوەیەکی پسپۆڕانەیە لەلایـەن ئەدیبێکی بالا دەسـتەوە کە چێژێـکی ئەدەبیی وردی هەبێ و لەوە بەدەرە کە من توانای ئەوەم ببێ بە درێژی لێی بدوێم و لـەوە زیاتری لەبـارەوە بڵێم کـە لە چڵە پۆپـەی وردی و ڕازاوەیی و جـوانی و ڕەوانبێژیدایە . هەر لەمەشەوەیە وا بە متمانەوە ئەڵێم ئەگەر ئەم شیرین و خوسرەوەی خانـا بە زمانی یـەکێ لە گەلە بـۆ لواوەکانی ڕۆژهەلات یا ڕۆژاوا نوسرابوایە ئیسـتا یەکێ لـە جوانتریـن و بەرزتـرین ئۆپێـرا و بالێتەکانی جیهانی لێ ئامادە کرابو شانۆ پایە بڵندەکانی جیهان بە شانازییەوە پێشانیان ئەدا و باشتـرین نومایندەیەکی ئەدەبی کـورد و گەلی کورد ئەبـو لە کۆڕ و کۆمەڵەکانی جیهانی ئـەدەب و هونەر و ڕۆشنبیریدا . بـەلام چارەڕەشی و نەگبەتییەکەی لەوەدایە بە کوردییە و هی کوردە !

لە چەند دێرێـکەوە کە خانا لە سەرەتای ئەم شیـرین و خوسرەوەیدا نوسیویە دیاری ئەدا کەوا شارەزای هونەری هەڵسەنگاندنی ئەدەبیش بوە . پێوانەی خانا بۆ شیعری سەرکەوتو بریتییە لەوە لەبارەی ناوەڕۆکەوە بێمەعنا نەبێ ، لـە ڕوی داڕشتنەوە ڕازاوە و جـوان بێ ، هاوسـەنگیش بێ . ئەمە هەڵسـەنگاندنێکی ڕاست و دروستە بۆ شیعر ئەگەر دیمەن و ناوەڕۆك لە یەك جوێ نەکەینەوە و ئەگەر نکوڵی لەوە نەکەین کە شیعر خاسیەتی هونەریی تایبەتیی هەیە لە پەخشانی جوێ ئەکاتەوە . ئێمە چیمان ئەوێ لە شیعر لە ناوەڕۆکێکی بەسود و دیمـەنێکی هونەری و جوان و هاوسـەنگیی تاکانی زیاتر ؟ تا ئەمڕۆ سەنگ و ترازویەکی لەمە وردتر بـۆ شیعر نەدۆزراوەتەوە مەگەر لای ئەوانەی لە هەمو خاسیەتێکی ڕوتی ئەکەنەوە .

خانا ئەڵێ :

**مەعلومەن هەر کەس بە هەر زوبانی ،**
**بواچو نەظمی جە هەر مەکانی ،**

**وێنەی عورۆسان زێبای موشك چین ،**
**بکەرۆش جە حوسن عیبارەت شیرین ،**

**خاریج جە مەعنێ نەبۆ مەضمونش ،**
**کریابۆ چون شیعر ( جامێ ) مەوزونش ،**

**جە لای خیرەدمەند دڵ پەسەند مبۆ ..**
**شێرینتەر جە شەهد شێرەی قەند مبۆ ..**

لە ڕوی لێکۆڵینەوەی مێژوی ئەدەبی کوردیشەوە بابەتێك لەم شێرین و خوسرەوەدا سەرنجی منی ڕاکێشاوە ، ئەوەش ناهاوجوتێی شیعری لاواندنەوەیە . هەندێ لەو شیعرانەی خانا بە زمانی شێرینەوە خوسرەویان پێ ئەلاوێنێتەوە (ل ـ ٧٠٧) هاوجوت نین. بۆ ؟ نازانم ! بەڵام بێگومانم لەوە کە ئەو جورە وشانەی لەم لاواندنەوەیەدا بەکارهێنراون لەوانە نین ئەوەندە کەم بەکاربهێنرێن هاوتایان بەئاسانێ بۆ پەیدا نەکرێ . بڵێی ئەوە نیشانەی یەکێك لە خاسیەتەکانی شیعری کۆنی لاواندنەوە و شێن و کوتەڵ بوبێ ؟ ئەمە بابەتێکە من ناتوانم بڕیاری تیا بدەم . بە ڕای من پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی زیاترە . ئەوەش بەندە بە دەسخستنی تێکستی کومەڵێك شیعری جورجوری لاواندنەوە بە کوتەلەوە کە پتر لە ناوچەکانی ڕوژهەڵاتی باشوری کوردستانا باوە .



لە شێرین و خوسرەوی خانادا نیشانەی دەنگ دانەوەی بیر و کرداری شوڕشگێڕێی گەلانی دراوسێ لە کوردستانا دیاری ئەدا . ( عماد الدين نسیمی ) شاعیر و ئازادبیرێکی ئازەربایجانێ بوە لە سالی ٧٧١ی کوچێ « ١٣٦٩ ــ ١٣٧٠ی . ز »دا لەدایك بوە و لە سالی ٨٢٠ « ١٤١٧ ــ ١٤١٨ »دا کونەپەرستان لە حەلەب پێستیان گرووە . خانا لە شیعرێکی شێرین و خوسرەوەکەیدا ناوی نەسیمێ ئەهێنێ و وەك کەسێك کە لە بیر و باوەڕی خوی پاشگەز نەبێتەوە ـ یادی ئەکاتەوە . بە زمانی مریەمی ژنی خوسرەوەوە کە وێستویەتی وەفا و خوشەوێستیی خوی بو خوسرەوی مێردی دەربڕێ ، ئەلێ :

**ئەر چون نەسیمێ مکەنان پوسم**
**هەرتا زیندەنان هەر تونی دوسم**

ئەمە لەبارەی زانینی ڕادەی بلاو بونەوەی دەنگ و باسی بیری ئازادێ خوازێ و شوڕشگێڕییەوە لە کوردستانا شتێکی بە بایەخە . پیاوێکی وەك نەسیمێ لە حەلەبدا بە فتێی کونەپەرستان بگرون و خانا لە کوێرە دێیەکی

کوردستانا دەنگ و باسی بزانێ و ناوی بخاتە ناو شیعریەوە ، نیشانەی ئەوەیە کوردستانیش لە کار تێکردنی بیری شۆڕشگێڕێ بێبەش نەبوە و لەتاریکایێ سەدەکانی ناوەڕاستا تیشکی بیری ئازادی گەیشتوەتێ .



لە لایەکیتری شیرین و خوسرەودا دەرئەکەوێ کەوا لە سەردەمی خانادا سەبێل کێشان گەیشتبوە کوردستان و کورد شارەزای تۆتن بوە . خانا سۆزی دلی شیرین لە دوریی خوسرەو ئەشوبهێنێ بە دوکەلی توتنی توند و ئەلێ :

**جە دماى یەك سـاڵ طوغیان کـەرد دەردش**
**سـەودا چـون دوی تونـد تەماکو بـەردش**

ئەوەی تائیستا زانراوە ئەوەتە لە دەوروبەری ١٦٥٠ای زایینیدا ، واتە ١٠٠ ساڵێك بـەر لە نوسینی خوسـرەو و شیـرینی خانا توتـن گەیشتوەتە ئێران . مقۆ مقۆی حەلالی و حەرامیی دوکەل کردنیش لەناو مەلاکانا و ئاخۆ ڕۆژوی پێ ئەشکێ یا نە ، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم سەردەمە . هەرچۆن بێ وابزانم ئەمە یەکەمین بەلگەیە مێژویەك بۆ پەیدا بونی توتن لە کوردستانا دیاری بکا .



مەسەلەیەکی گرنگ کە لە خوێندنەوەی تێکستی شیرین و خوسرەوەوە ئەتوانین بێگەینێ ئەوەتە شیرین خوسرەوی بە دڵ خۆش وێستوە هەرچەند نەشگەیشتوەتە ڕادەیەك خۆشەویستییەکەی بەسەر عەقلیا زاڵ ببێ . بەلام خوسرەو تەنها شوێن ئارەزو بازیی خۆی کەوتوە و شیرینی بۆ ئەم مەبەستە وێستوە . لە لایەکیکەشەوە فەرهاد دلدارێکی ڕاستەقینەی شیرین بوە ، کەچی شیرین لەوەندە زیاتر نەبوە کە بەزەیی پیا هاتوەتەوە و تەنانەت وەك برای خۆیشی تەماشای کردوە .

ئێمە ئەگەر سـەرنجی ئەوە بدەین کە کچە شـازادەیەکی وەك شیرین جارێك دەستی لە کەس و کاری خۆی هەلگرتوە و ناشارەزا ڕێی گرتوەتەبەر لە ئەرمەنستانەوە تا مەدائین هاتوە و ساڵەها لە قەسری شیرین بە تەمای دل کوێرەوەریی کێشاوە و جارێکیکەش دەسبەرداری تەخـت و تاجی خۆی بوە و هـاتوەتەوە بۆ مـەدائین و ئەمجاریش چـەند ساڵی ڕەبـەق بە تەمای خوسـرەو ژیانی تـاڵ و سوێری لە کۆشکێکی دور لە دەربـاری شاهانەی خوسرەودا بردوەتە سـەر و لەپێناوی خۆشەویستیدا ئـەم هەمو جەور و جەفایەی کێشاوە و هەر ئەوەندە بوە بیری خۆی نەدوڕاندوە و خۆی نەداوە

به دەستەوە و ، لە لایەکی‌کەشەوە سەرنجی ئەوە بدەین کە خوسرەو کە چەند ئارەزۆی گەیشتنی بە خوسرەو لە دلا بوە ـ لەبەر سۆدی تایبەتی خۆی گوێی بـە خۆشەویستیی شیرین نەداوە و مریـەمی کچی قەیسەری رۆمی هێناوە و پاشانیش گوایە لەبەر سۆدی ئەوەی کە خۆی ناوی ئەنێ تاج و تەخت نەهاتوە شیرین مارە بکا تا مریەم مردوە و لەوە زیاتر پاشانیش چوە ئافرەتێکی دەلالی ئەسفەهانیی هێنـاوە کە دەیان کەنیزەکی لە مـالی خۆیا ڕاگرتوە بۆ پێ ڕابواردنی گەورە گەوران و نەیکردوە لەجیاتیی ئەو شازادەیەکی جوان و گیرۆدەی دەردی خۆشەویستیی ئـەو خۆیی وەك شیرین مـارە بکا و هەر تەقەلای فریودان و هەلخەلەتاندنی بوە بۆئەوەی بە خـۆڕایی خۆی بدا بە دەستەوە ، تا لەئەنجاما خۆ ڕاگرتنی شیرین و سەر شۆڕ نەکردنی ناچـاری کردوە قایل ببێ بە مـارە بڕینی ، ئەگەر ئەمە هەمـو لێك‌بدەینـەوە بۆمان دەرئەکەوێ ئـەوەی پێی‌ئەلێن خۆشەویستـیی شیرین و خوسـرەو هەر لەلایەن شیـرینی ئافرەتی بەوەفـاوە بوە کە پاشـانیش هەر لەپێنـاوی ئەو وەفایەدا خۆی کوشـت و ، خوسرەو لە کابرایەکی ئـارەزۆ پەرستی ڕۆت و بەرەللا بەولاوە نەبوە .

کە سەرنجی ڕازی فەرهاد و شیرینیش ئەدەیـن و ئەبینین فەرهادی دلدار کە بە یەکەم دیتن گرفتاری تیری خۆشەویستیی شیرین بوە ، چۆن لەپێناوی ئەم خۆشەویستـییەیدا لە ڕۆی شایەکی گەورە و بەدەسەلاتی وەك خوسرەودا سەری هەلبڕێ و چۆن بە هێزی دلداریی ئەو تونێلە مەزنەی تاق وەسانی کون کرد و ئەو هەمۆ نەخش و نیگارە مێژۆیی و نەمرەی لەو تاشـە بەردانە هەلکەند و چۆن پاشانیش کە هـەوالی درۆ و بە پیلان ساز کـراوی مەرگی شیرینی بیست لەداخانا گیانی دەرچۆ ، کەچی شیرین لە هەسـتی بەزەیی هاتنەوەیەك بەولاوە بەرابەر بە فەرهاد هیچ لە دلیا نەبو ، تەنانەت بە برای خۆیشی دایە قەلەم ( ل ــ ٥٥٧ ) ــ بۆمان دەرئەکەوێ لەم سەریشەوە خۆشەویستی هەر لە یەك لاوە بوە کە فەرهـادە و شیرین خۆشەویستیی فەرهادی لە دلا نەبوە و جیاوازییەکی زۆر لەنێوان خۆشەویستی و ڕێز لێ گرتن و بەزەیی پیا هاتنەوەدا هەیە .



بابەتێکی‌تر کە لە خوێندنەوەی ئەم ڕازەوە خۆی دائەسەپێنێ مەسەلەی دیـاریی کردنی نەتـەوەی شیرینە . شـیرین بە درێژایی تێکسـتەکە و لە فۆلکلۆری میللی‌یشدا هەر بە ( شیرینی ئەرمـەن ) ناوبانگی دەرکردوە . لـە سەرێکی‌کەشەوە ناوی شیرین ناوێکی کوردییە و لەنـاو ئەرمەندا باو نیە .

ڕەوشتی شیرینیش دەق لە ڕەوشتی کچە کورد ئەچێ . ئەو ناوچەیەش کە شیرینی تیا ژیاوە ئەگەر کوردستانیش نەبێ دراوسێی کوردستان و ناوچەیەکی فرە نەتەوەیە . چ ( گەنجە ) وچ ( بەردەع ) و چ ( موغان ) کە هەمۆ ئێستا ئەکەونە بەر ئازەربایجانی ئێران و سۆڤیەت لەو ناوچانە نین کوردیان تیا نیە . خۆ ( مەهستان )یش کە یەکێکی کەیە لەو شوێنانەی شیرینیان تیا ژیاوە ، دەق بەشێکی کوردستانە . لە سەرچاوەکانی پێش و پاش ئیسلامدا تا چەند سەدەیەکێش وشەی ( کوردستان ) بەرچاو ناکەوێ . کتێبە مێژۆییەکانی ئیسلام کوردستانی باکوریان خستوەتە چوار چێوەی وڵاتی ( ئەرمینیا )وە . کوردستانیباشور و ڕۆژهەڵاتیش یا ( کۆهستان )ە کە بە عەرەبێ کراوە بە ( قهستان ) و ( بلاد الجبل ) یا ( مەهستان )ە کە دیارە ناوچەی دەشت ئەگرێتەوە . من بە متمانەوە ناتوانم بێڵێم ، بەڵام وام بە خەیاڵا دێ شیرین هیچ نەبێ دایکی کورد بوە . بۆیەش ئەڵێم هەر دایکی چونکە پوری واتە خوشکی باوکی کە ناوی لە شیرین و خوسرەوەکەدا زیاتر بە (مەهین بانۆ ) دێ و ئەم ناوەش بۆ کوردێ دەس ئەدا ، خانا خۆی ئەڵێ بە زمانی ئەرمەنێ ناوی ( شەمیرا ) بوە . ئەمە تەنها بۆ چۆن و ڕێ تێ چۆنێکە من دەریئەبڕم و ئەشزانم بەڵگە هێنانەوەکانم لە چوار چێوەی ڕێ و شوێنی زانستیدا نین . بەڵام هەر چۆن بێ ڕێی خۆم نەدا ئەوەی لەم ڕوەوە بە بیرما هاتوە نەیخەمە سەر کاغەز .



لە دوا ـ دوایی ئەم سەرەتایەدا ئەمەوێ ڕۆی دەمم بکەمە ئەو کوردانەی بەڵگەی دستنوسی کۆنیان لایە و ، دەستەو داوێنیان بم کەوا بیرێ بکەنەوە.. کاتی ئەوە هاتوە سودی نەتەوەکەیان و ژیاندنەوەی کەلەپوری دێرینی بخەنە پێش شێوەی تەسکی بیر کردنەوەی خۆیانو چیبیان لایە بیخەنە ژێر دەسەڵاتی دەسگا زانستییەکان بۆئەوەی مەیدانی کەڵك لێ وەرگرتنیان فەراهەم بێ و ئیتر بەس پاشماوەی دێرینمان مۆرانە بیخوا و تۆزی لێ بنیشێ و لە سوچی تاق و کلاو ڕۆژنە و سندوقە شکاوی کۆنا بفەوتێ .

**محمدی مەلا کریم**

# کورتەی ژازی شیرین و خوسرەو

خانا لە سەرەتادا بەشێکی کتێبەکەی تەرخان کردوە بۆ باسی لەدایکبونی خوسرەوی پەرویز و بۆمان ئەگێڕێتەوە کەوا چۆن پەرویز پاش کۆچی دوایی ئەنەوشیرەوانی باوکی بۆ بە شاو و شایەتییەکی بە شـان و شکۆی دەست دایە و لە کوڕێ زیاتر کە ببێ بە جێنشـینی هیچی ناتەواو نـەبو . خوا ئەو کوڕەشی دایە و ناویان نا خوسرەو و ئەستێرە شناسان تەماشای ئەستێرەیان بۆ کرد و خوێندیانەوە کەوا بەختی یار ئەبێ و شایەکی خاوەن پایە و جێگەی بەرزی لێ دەرئەچێ .

پاش باسـی پەروەردە کردن و گەورە بونی خوسـرو و سـپاردنی بە ( بوزورگ ئومێد )ی زانـا و خاوەن بیر و ڕا بـۆ پێخوێندن و لە کاروباری حوکمڕانێ فێر کردنی ، خانا دێتە سـەر ئەوە کە جارێکیان خوسرەو لەگەڵ هەندێ لە دەست و پێوەندەکانیا ئەچێ بۆ ڕاو و لەوێ ڕێیان ئەکەوێتە دێیەکی خۆش . شەو لەوێ ئەمێننەوە تا بەیانێ بە بەزم و ئاهەنگ و ڕابواردن بەسەر ئەبەن . لەوکاتەدا یەکێ لە نۆکەرەکانی ئەچێتە ناو باخی کابرایەکەوە هەندێ بەرسێلە لە مێوێك ئەکاتەوە . سبەینێ کە ئەگەڕێنەوە یەکێکیکە لە دەست و پێوەندەکانی ئەم هەواڵە بۆ پـەرویزی باوکی ئەگێڕێتـەوە و پەرویزیش زۆر لێی دلگیر ئەبێ و فەرمان ئەدا هـەردو پێی ئەسـپەکەی ئەبڕنەوە و زێن و لەغاوەکەی ئەدەن بە کابرای باخەوان و نێنۆکی نۆکەرەکەشی دەرئەهێنن و ، خۆشی لۆمە و سەرزەنشتێکی زۆری خوسـرەو خۆی ئەکا . خوسرەویش دەست ئەکا بە گریان و زارییەکی بەسۆز و داوای خۆش بون ئەکا لە باوکیو گەورە گەورانی دەربـار بۆی تێئـەکەون و ئـەبن بە تکاکار لای باوکی تا لێی ئەبوری و ئەشی کا بە جێنشینی خۆی .

شـەوێکیان ئەنەوشـیرەوانی بـاپیری دێتـە خـەوی بەرابـەر بەو سەرزەنشت و پێی ئەسپ بڕینەوەی کە وەختی خۆی پەرویزی باوکی لەگەڵی

کردبـو دڵخۆشـی ئەداتەوە و مـژدەی ئـەداتێ کـەوا خوا لەجـیاتێ سەرزەنشتەکەی باوکی کچێکی جوانی دێنێتە ڕێ ئەبێ بە هاوڕێی و لەجیاتێ ئەسپە دەست و پێ بڕاوەکەی ئەسپێکی باشتری بۆ ئەنێرێ و مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژی لێهاتویشی پێ ئەبەخشێ .

خوسرەو کـە خەبەری ئەبێتەوە لەم خـەوەی زۆر شادمان ئەبێ . لە بارەگای خوسرەودا وێنەکێشێکی هەڵکەوتو ئەبێ ناوی شاپۆر ئەبێ ، ڕۆژێ لە ڕۆژان وادیارە باسی ژنهێنان بۆ خوسرەو ئەکەن ، بۆی ئەگێڕێتەوە کەوا لە ناوچەی ( مەهسـتان ) لای دەریاچەی دەربەند « کـە دەریاچەی خەزەرە » شاژنێك هەیە ناوی بە ئەرمەنێ ( شەمیرا )یە کە بە زمانی خۆمان واتە (مەهێن بانۆ ) شان و شکۆیەکی زۆری هەیـە و بێ مێرد بەسەر ئـەبا ، برازایەکی میراتبەریەتی کە ئەویش کچێکی شۆخە ناوی ( شیرین )ە و ، زۆر بە باڵای شیرینا هەڵئەدا تا خوسرەو بەتەواوەتێ گیرۆدە و فریفتەی ئەبێ و لە نەدیتو دڵی لێ ئەچێ .

خوسرەو شاپۆر ئەنێرێ بـۆ وڵاتی مەهستان تا هـەواڵی شیرینی بۆ بێنێ و بزانێ چۆنی بخوازێ . شاپۆریش ڕێگایەکی دوور ئەبڕێ تا ئەگاتە ئەو ناوچەیـە و بە پرسـان شـوێنی سەیـران و ڕابـواردنی شیرین ئەدۆزێتەوە ، وێنەیـەکی خوسرەو ئەکێشـێ و لەسەر ڕێـگای شیرینا بە دارێکا هەڵیئەواسێ . شیرینیش کە بە عادەتەکەی خـۆی ئەچێ بۆ ڕاو و ڕابواردن لـە جێـگای حەسانـەوەی خۆیەوە ئەبێـنێ وێنەیەك بـە دارێکا هەڵواسراوە ئەنێرێ ئەیهێنن بۆی . هەر بە دیتـنی دڵی لێ ئەچێ و وەزعی ئەگۆڕێ . کەنیزەك و خوڵامەکانی ترسی ئەوەیان لێ ئەنیشێ ئەو کارە کاری دێو و جنۆکە بێ . لەبەرئەوە وێنەکە ئەدڕن و یاتاخ ئەپێچنەوە ئەڕۆن .

شاپۆر کە بەمە ئەزانێ جارێکیتر وێنەی خوسرەو ئەکێشێتەوە و لـە نزیکی نشێنگەی تازەی شیرینەوە هەڵیئەواسێتەوە . شیرین ئەم وێنەکەش ئەبینێ ، لە جوانێ سەرسام ئەبێ . دەست و پێوەندەکانی دیسان وێنەکەی لێ دوور ئەخەنەوە و لەو شوێنەش بار ئەکەن . شاپـور دەس بەردار نابێ . بۆ سبەینێ جارێـکیکەش وێنەی خوسرەو ئەکێشێ و ئەیـکاتەوە بە دارا . شیرین ئەیبینێ و زۆر بۆی پەرێشان ئەبێ و وەخت ئەبێ لە هۆشی خـۆی بچێ . کەنیـزەکەکانی دەور و پشتی ئەترسن مەسەلەکە ئاخـرێ خراپی لێ بوەشێتەوە ، بڕیار ئەدەن بکەونە پەیجۆر بەڵکو لەبارەی ئەو وێنەوە شتێك بزانن ، بەڵام هێچ ئەنجامێکیان دەسگیر نابێ . بۆ لە بیر بردنەوەی مەسەلەکە دەست ئەکەنـەوە بە بـەزمو ئاهەنگ . بـەڵام شیرین لەگـەڵ بەزمی مەی

خواردنەوەشدا هەر بە تەماشای وێنەکەوە خەریك ئەبێ . شاپوور کە لە شوێنێکا خۆی شاردبوەوە ، تێ‌ئەگا شیرین لە چ‌حالێکدایە ، خۆی بە کەنیزەکەکانی شیرین ئەناسێنێ ، باسی وێنە و خاوەن وێنەکەیان بۆ ئەکا . یەکێکیان قسەکانی شاپوور بۆ شیرین ئەگێڕێتەوە . شیرین هەڵئەستێ ئەچێ بۆ لای شاپوور و لێی ئەپاڕێتەوە هەموو شتێکی بۆ ڕوون بکاتەوە . ئەویش زۆری بە شان و باڵی خوسرەودا بۆ دێ و تێی‌ئەگەیەنێ کەوا خوسرەو ناردوویە بۆ ئەوێ هەواڵی شیرینی بۆ بزانێ .

شیرین زیاتر خوسرەوی ئەچێ بە دڵا . ئەکەوێتە بیر کردنەوە لەوە چۆن پێی بگا . ڕوخسەت لە پووری ئەخوازێ ، سواری شەودێز ببێ بچێ بۆ ڕاو . لەگەڵ کۆمەڵێ کەنیزەکی خۆیا سوار ئەبن و ئەڕۆن . کە لە ئاوەدانێ دوور ئەکەونەوە ، ئەو تێی‌ئەتەقێنێ ئەڕوا و هاوڕێکانی بەجێ‌دێڵێ . ئەمانیش هەرچەند بەدوایا ئەڕۆن بەڵکو بیگرنەوە سوودی نابێ . ناچار بە دەم شین و زارییەوە دێنەوە بۆ ماڵ و مەسەلەکە بۆ مەهین بانووی پووری ئەگێڕنەوە . مەهین بانو ئەڵێ هەر ئەمزانێ ئەمەم دێتە ڕێ چونکە خەوم دیبوو .

مەهین بانووی پووری زۆر دڵگیر ئەبێ و دەست ئەکا بە زاری و شین . بەڵام چی‌ی لە دەسەڵاتدا نابێ . لەولاشەوە شیرین کە ئەڕوا لە ڕێگەدا لە سەرچاوەیەك لا ئەدا خۆی ئەشوا . لەوسەریشەوە خوسرەو هەمیشە چاوەڕوانی گەڕانەوەی شاپوور و هەواڵ هێنانی شیرین ئەبێ . لەو دەمەدا بە فیتنەی ئاژاوەگێڕ و پیاو خراپان ناکۆکییەك ئەکەوێتە نێوان ئەو و باوکی . باوکی بڕیاری گرتنی ئەدا . بوزورگ ئومێدی مامۆستای ئامۆژگاری‌ی ئەکا کە بۆ ماوەیەك خۆی ون بکا . ئەویش بڕیار ئەدا بچێ بۆ ئەرمەنستانی وڵاتی شیرین . بەڵام پێشان پیاوەکانی ڕائەسپێرێ ئەگەر کچێکی‌وا و وا هات حورمەتی بگرن و جێگایەکی خۆشی بۆ ئامادە بکەن و کۆشکێکی جوانی لە شوێنێکی باشا بۆ بکەنەوە و چی‌ی ئەوێ بۆی بکەن تا ئەم خۆی دێتەوە . پاشان ئەکەوێتە ڕێ و ئەڕوا . کە ئەگاتە سەرچاوەکە کە شیرین لەوێ خەریکی خۆ شتن ئەبێ ئەیبینێ ، زۆر سەرسام ئەبێ لە جوانییەکەی . لە شوێنێکی کلاوە دەست ئەکا بە سەیر کردنی . کە شیرین پێی‌ئەزانێ گورج لە ئاوەکە دێتە دەرەوە جلەکانی لەبەر ئەکا و سوار ئەبێ ئەڕوا . کەسیان دڵنیا نابن لە یەکتر . بەڵام هەرکامیان بە دڵیانا دێ کە ئەمە ئەو کەسەیە ئەو بەدوایا ئەگەڕێ . خوسرەو پاش ڕۆیشتنی شیرین زۆر خەفەت ئەخوا کە چۆن نەچوو بە لایەوە و قسەی لەگەڵ نەکرد و خۆی پێ نەناساند . بەڵام پەشیمانی بێ‌سوودە . لەملاوە شیرین ئەگاتە مەدائین و لەولاشەوە خوسرەو ،

ئەگاتە ئەرمەنستان . پیاوەکانی خوسرەو شیرین ئەناسنەوە و بەوجۆرە کە ئەو ڕای‌سپاردبو ئەچن بە دەمیەوە و خزمەتی ئەکەن و ئەویش بە چاوەڕوانیی خوسرەوەوە دائەنیشێ .

لەم سەریشەوە کە خوسرەو ئەگاتە ( بەردەع ) کە گەرمەسێری مەهێن بانۆی پوری شیرین بوە پێشوازییەکی گەرمی لێ ئەکەن و تا خوسرەو لەوێ ئەبێ لە خزمەت کردنیا کەمتەرخەمێ نانوێنن .

شیرین لەپاش چاوەڕوانییەکی زۆر لە مەدائین بێتاقەت ئەبێ و داوا ئەکا بیگوێزنەوە بۆ شوێنێکی‌کە . بەڵام دەست و پێوەندی خوسرەو لەجیاتیی ئەوەی لەسەر ڕاسپێریی خوسرەو شوێنێکی خۆشی بۆ هەڵبژێرن خانۆی بۆ تیا بکەنەوە ، لەو شوێنەی ئیستا پێی‌ئەڵێن ( قەسری شیرین ) خانوی بۆ ئەکەنەوە . شوێنەکە بە دڵی شیرین گەرم و ناخـۆش ئەبێ ، بەڵام ئەڵێ چش . بە چاوەڕوانیی خوسرەوەوە لەوێ دائەنیشێ و کات بەسەر ئەبا .

لەولاشەوە شەوێکیان خوسرەو لە میوانخانەکەی خۆیدا ئەبێ لەگـەڵ دەست و پێوەندەکانیا بە ئاهەنگ و ڕابواردنەوە خەریك ئەبێ . شاپور ڕازی دیتنی خۆی و شیرینی بۆ ئەگێڕێتەوە و تێی‌ئەگەیەنێ کـە ئیستا لەوانەیە شیرین لە مەدائین بێ . خوسرەو بەوە زۆر شادمان ئەبێ و بڕیار ئەدا شاپور بنێرێتەوە بۆ مەدائین بەدوای شیریندا و ئەمەش بە مەهێن بانۆ ڕائەگەیەنێ . شاپور بە سواریی ( گوڵگون ) ئەڕواتەوە بۆ مەدائین و پاش مانگێ ئەگاتـە بەرەوە ، ئەچێتە کۆشـکەکەی شیرین ، ئەبینێ لە چحاڵـێکی ناخۆشدایە ، زۆر بـۆی خەفەتبـار ئـەبێ . شـیرینیش سـەرگوزەشتەی خـۆی بـۆ ئەگێڕێتەوە ، پاشان هەردوکیان پێکەوە بەرەو ئەرمەنستان ئەگەڕێنەوە .

لەم سەردەمەدا پـەرویزی باوکی خوسرەو ئەمـرێ و هەواڵ ئەگا بە خوسرەوی کوڕی . خوسـرەو دێتەوە بۆ مەدائین . کە ئەگـاتە جێ ئەزانێ شیرین لەگەڵ شاپوردا گەڕاوەتەوە بۆ ئەرمەنستان ، زۆری پێ ستەم ئەبێ . شیرینیش لەگەڵ شاپور ئەگەنەوە ئەرمەنستان و پێشوازییەکی گەرم لـە شیرین ئەکرێ . شیرین و پوری بە دیداری یەك شاد ئەبنەوە .

کە خوسرەو لەسەر تەخـتی شایێ دائەنیشێ زۆری پێ نـاچێ ( بارام چۆبین ) کە یەکێ ئەبێ لە سەرکردەکانی لەشـکر لیی یاخێ ئەبێ و پیلانێکی بۆ ڕێك‌ئەخا بیگرێ و بۆ ئەم مەبەستە دەست لەگەڵ هەندێ لە سەرکردەکانی سوپادا تێکەڵ ئـەکا . خوسرەو کە ئەزانێ لانی زەبـوون بوەو کەسی بە دەورا نەماوە لە تەنگانـەدا فریای کەوێ ، هەر ئەوەنـدەی پێ ئەکرێ خۆی دەرباز

ئەکا و بەرەو ئەرمەنستان هەڵدێ .

کە خوسرەو ئەگاتــە بەرەوە شیــرین لە ڕاو ئەبێ . لە چــەقی ڕێگادا هەردو بە یەك ئەگەن و بــۆ یەکەمجار بە دیدار و ناســینی یەك شاد ئەبن . پێکەوە ئەگەڕێنەوە بۆ دیوەخانی مەهین بانوی پوری شیرین . مەهین بانو دێ بە پێشوازیانەوە و خوسرەو لەوێ نیشتەجێ ئەبێ . مەهین بانو ئەترسێ بەر لەوەی خوسرەو خوازبێنیی شیرین بکا و بیهێنێ هەڵی فریوێنێ . بۆیە ئامۆژگاریــەکی زۆری ئەکا و وریای ئەکاتەوە . ئیتــر هەرچەند خوسرەو و شیرین بە یەك ئەگەن و پێکەوە دائەنیشن ئەنجامێکی ئەوتۆی بۆ خوســرەو نابێ و شیرین وەك کێوێکی سەخت لە ڕۆیا ئەوەستێ .

بەوچەشنە گەلێ جار شیرین و خوســرەو پێکەوە ئەچن بۆ سەیران و ڕاو و ڕابــواردن و تەنانــەت جارێکیشــیان شێرێك هێرشــیان بۆ دێنێ ، خوسرەو بە زەبری مشتەکۆڵە ئەیکوژێ و ئەڵێ پێستەکەی بگورۆن . بەمــە ئەوەندەی‌تر بە دڵی شیرینا ئەچێ و تەنانەت شیرین بۆ یەکەم جار ماچیشی ئەداتێ . جارێکیان شیرین لەگەڵ کەنیزەکەکانی ئەچێتە مەجلیسی خوسرەو و پێشان ئامۆژگاریی کەنیــزەکەکانی ئەکا کە هەرکامــیان بە گۆرانێ و بە دەم مۆسیقاوە چــەند شــیعرێك لەبــارەی دڵــداریی خــۆی و خوســرەوەوە بخوێننەوە و بەوجۆرە شیرین زیاتر دەرونی خوسرەو ئەورووژێنێ . خوسرەو بۆ گەیشتن بە شیرین ئەکەوێتە پەلەقاژێ ، بەڵام هەرچــەند لێی‌ئەپاڕێتەوە سود نابەخشێ و لەم مەیدانەدا گفتوگۆ و ڕاز و نیازێکی زۆر لەنێوانیانا ڕو ئەدا کە خوسرەو هێچی لێ دەسگیر نابێ . دوا جار شیرین تانوتی ئەوەی لێ‌ئەدا کەوا ئەو تەخت و تاجی داگیر کراوە و ئەگەر پیاو بوایە جارێ ئەچو تەخت و تاجەکەی بسەنێتەوە لەجیاتیی ئەوەی خۆی بە دڵــدارییەوە خەریك بکا . خوسرەو لەمە توڕە ئەبێ و ئەتورێ و ڕو ئەکاتە وڵاتی ڕۆم بۆ داوای یارمەتی لە قەیسەر تا لەشکری بخاتە تەك بڕوا بارامی چوبین ببەزێنێ و حوکمڕانیی خۆی دەس‌خاتەوە . کە ئەگاتە بەرەوە قەیسەر پێشوازییەکی گەرمی لێ ئەکا و مریەمی کچی خۆی لێ مارە ئەبڕێ و لەشکری لەگەڵ ئەنێرێ بۆ سەر بارام . بارام لەپاش شەڕێکی سەخت و قورس ئەبەزێ و هەڵدێ و خوسرەو دێتەوە سەر تاج و تەختی خۆی و دەست ئەکا بە ئاوەدان کردنەوەی وڵات . بــەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کــە مریەمی کچی قەیسەری هێــناوە دڵی هەر بۆ شیرین ئەگرێ و وەزعی زۆر ناڕەحەت ئەبێ بۆی و دەسەڵاتی کــردنی هێچی نابێ . لەولاشەوە شیرین لەو ناڕەحەتــر ئەبێ بۆ ئەو و ڕۆژ تا ئێوارە و ئێوارە تا بەیانی هەر ئەگریێتەوە و گلەیی لە کردەوەی خۆی و چارەی سیای خۆی ئەکا .

لەو سەردەمەدا مەهێن بانوی پوری شیرین ئەمرێ و شیرین لەجێی ئەو ئەچێتە سەر تەختی شایی . بەڵام بیری هەر لای خوسرەو ئەبێ . تا ساڵێ بەوچەشنە بەسەر ئەبا . ئاخری ئارام و ئۆقرەی لێ ئەبڕێ و بەرەو مەدائین ئەکەوێتە ڕێ . خوسرەو ئاگادار ئەکەن کەوا شیرین هاتوە . بەڵام لە ترسی مریەمی ژنی ناوێرێ بچێ بە لایا . شیرین بۆ خۆی لە کۆشکەکەی خۆیدا نیشتەجێ ئەبێ .

لەو دەمەدا هەواڵی مەرگی بارام چۆبین دێنن بۆ خوسرەو . خوسرەویش ئەندامانی ئەنجومەنی دەست و دائیرەی خۆی کۆئەکاتەوە و لەوبارەیەوە بۆیان ئەدوێ و هەرچەند بە دەم پێ ناخۆش بونی خۆی بۆ ئەو دوا ڕۆژە ڕەشەی هاتە ڕێی بارام ـ دەرئەبڕێ ، بەڵام لەڕاستیدا زۆری پێ خۆش ئەبێ و کۆڕی ڕابواردن ئەبەستێ و باربودی گۆرانی‌بێژی بەناوبانگ لەو ئاهەنگەدا گۆرانییان بۆ ئەڵێ و ئاوازی خۆشیان بۆ لێ‌ئەدا .

خوسرەو لە سۆزی شیرین خۆی پێ ڕاناگیرێ . داوا لە مریەم ئەکا ڕێی بدا شیرین بێنێ . بەڵام مریەم نەك هەر ڕێی نادا ، زۆریش ئاگاداری ئەکا بیر لە شتی‌وا نەکاتەوە . خوسرەو کە ناوێرێ خۆشەویستییەکەی بەسەر حوکمڕانییەکەیدا زاڵ بکا ، لەوە زیاتری بۆ نامێنێتەوە کە جار و بار پەیغامێ بنێرێتە لای شیرین . ئەم دەورە هەمو جارێ شاپور ئەیبینێ و پاکانەی بۆ لا ئەکا کە خوسرەو بەڕاستی خۆشی ئەوێ ، بەڵام ناتوانێ سودی وڵاتەکەی ڕەچاو نەگرێ . شیرین لەم هەڵویستەی خوسرەو زۆر دڵگیر ئەبێ و تۆڕە ئەبێ و پەت پەتییەکی زۆری پێ ئەکا .

لەم قۆناغەدا شتێکی تازە دێتە نێوان ڕازی دڵداریی شیرین و خوسرەووەوە . ئەویش مەسەلەی فەرهادی بەرد هەڵکەن و پەیکەرتاشی چینییە .

شیرین لە کۆشکەکەی خۆیدا پێویستی بە شیر ئەبێ ، بەڵام ڕانی لێ دور ئەبێ و شیری بەئاسانێ پێ ناگا . ئەم خواستەی خۆی بۆ شاپور دەرئەبڕێ . شاپوریش باسی فەرهادی بۆ ئەکا کەوا هونەرمەندێکی ئەوەندە بەبەهرەو لێ‌هاتوە ئەتوانێ جۆگەلەیەك لە بەرد هەڵکەنێ لەنێوان لەوەڕگەی ڕانەکە و کۆشکەکەی شیرینا لەوسەرەوە ئاژەڵی بدۆشنە ناو و شیرەکە بە جۆگەلەی بەردا بێت تا ئەگاتە کۆشکی شیرین .

شاپور فەرهادی بۆ بانگ ئەکا . شیرین پێشوازییەکی گەرم لە فەرهاد ئەکا . فەرهاد گوێ بۆ فەرمودەکانی شیرین شل ئەکا ، بەڵام هێچی لێ حاڵێ

نابێ چونکە هەر بە یەکەم دیتن گرفتاری تیری چاوی ئەبێ و ئەپێکرێ . هەر ئەوەندە ئەزانێ بلێ بەلێ و ئیتر بەس .. کە پاشان لە مەجلیسی شیرین ئەچێتە دەرەوە داوا لە شاپوور ئەکا قسەکانی شیرینی بۆ دووبارە بکاتەوە . فەرهاد بە ئارەزووی دلی شیرین ، جۆگەلەیەك لە بەرد هەلئەکەنێ . بەلام بە جۆرێ گرفتاری دەردی دلداری ئەبێ جلەوی لە دەستی خۆیا نامێنێ و باسی ئەبێ بە بنێشتە خۆشەی ژێر زمانی خەلك .

خوسرەو بەمە ئەزانێ . ئەنێرێ بەدوای فەرهادا ئەیهێنن بۆ لای . گفتوگۆیەکی دوور و درێژ لەنێوانیانا ڕوئەدا . فەرهادی دلداری ژێر تەئسیری دل کەوتو ، بێ ترس لە حوزووری خوسرەوا قسە ئەکا . خوسرەو بەدوای فێلێکا ئەگەڕێ فەرهادی پێ لەناوبەرێ . شاخێکی بۆ دیارێ ئەکا هەلی‌کەنێ‌و ڕێگایەکی پیا بکاتەوە خەلك پێویستیان بەوە نەمێنێ سەرکەونە سەر کێو ، بە ڕێگاکەی ئەمدا تێپەڕن بچنە ئەودیو . فەرهاد ئەلێ بەسەر چاو ، بەلام بە مەرجێ ئەگەر توانیم و کارەکەم کرد دەس بەرداری شیرین ببێ بۆم . خوسرەو هەرچەند لەم قسەیەی فەرهاد زۆر تووڕە ئەبێ ، بەلام دان بە خۆیا ئەگرێ . لەو باوەڕەدا ئەبێ فەرهاد هەرگیز مەرجەکەی بۆ جێ‌بەجێ ناکرێ ، لەبەرئەوە گفتی ئەداتێ . فەرهاد ئەڕوا و دەس ئەکا بە کار . تونێلەکە هەلئەکەنێ . نەخش و نیگارێکی جوان بە شاخەکەوە دائەتاشێ کە ئیستاش ماوە . لەو نەخش و نیگارانەدا دیمەنی شیرین و خوسرەو و ڕاو و شەڕی خوسرەو و کارکردنی خۆی و گەلێ شتی‌تری دروست کردوە . فەرهادی دلدار بە هێزی خۆشەویستی ئەو کارە گرانە ئەگەیەنێتە ئەنجام . شیرین کە بەمە ئەزانێ ئەچێتە سەیری . فەرهاد لە جاران زیاتر شێفتەی شیرین ئەبێ . لەو سەردانەدا ماینەکەی شیرین پێی هەلئەخلیسکێ . بەلام فەرهاد گورج ئەگاتە فریای و شیرین و ماینەکەی هەلئەبڕێ و بۆ ئەوەی خوسرەو بە هاتنەکەی نەزانێ ئەیانگەیەنێتەوە جێی خۆیان . دوو زمان زۆر ئەبن . قسەکە بە خوسرەو ئەگەیەننەوە . خوسرەو ترسی ئەوەی لێ ئەنیشێ فەرهاد کارەکە تەواو بکا و ئەویش ناچار ببێ گفتەکەی خۆی بێنێتەدێ . ڕاوێژکەرانی دەربار کۆئەکاتەوە تا بیرێکی لێ بکەنەوە چۆن چاری ئەم مەسەلەیە بکەن . یەکێکیان پێشنیار ئەکا پیرەژنێکی ناشیرین بنێرن لای فەرهادا دەست بکا بە زارێ و شین کەوا شیرین مردوە ، بەلکو فەرهادیش لەداخانا بمرێ یاخود خۆی بکوژێ . پیرەژن ئەڕوا و دەست ئەکا بە هاوار و فوغان و ڕۆ ڕۆ کەوا شیرین مردوە . فەرهاد کە ئەمە ئەبیستێ دەست لە کار ئەکێشێتەوە و قولەنگەکەی ئەدا بە تەپلی سەری پیرەژندا ئەیسووێ بە تاشە بەردێکا . پاشان دەست ئەکا بە شینێکی بەسۆز و ئەلێ ئیتر پاش مەرگی شیرین ژیانم

بۆ چییه ؟ سوجدەیەك ئەباتە سەر زەویّ و هەناسەیەك هەڵئەکێشێ و گیانی دەرئەچێ .

شیرین کە بەمە ئەزانێ زۆر دڵگران ئەبێ . دێتە سەر تەرمەکەی فەرهاد و بەسۆز ئەیلاوێنێتەوە . پاشان فەرمان ئەدا بە قەدر و حورمەتەوە بیشۆرن و کفنی پێوە بپێچن و بە خاکی بسپێرن . خوسرەویش پاش ئەوەی کە دڵی دائەمرکێتەوە و ترسی فەرهادی لە دڵا نامێنێ نامەیەك بۆ شیرین ئەنوسێ گوایە پەشیمانێی خۆی لەم کردەوەیە دەرئەبڕێ و داوای لێ ئەکا خەفەت نەخوا بۆ فەرهاد . شیرین لەم نامەیەی خوسرەو زۆر دڵگیر ئەبێ و لە کۆشکەکەی خۆیا بە خەمگینێ ڕۆژگار بەسەرئەبا .

هەر لەم سەردەمەدا مریەمی کچی قەیسەر و ژنی خوسرەویش ئەمرێ . شیرین سەرخۆشێ نامەیەك بۆ خوسرەو ئەنوسێ و لە دوایێدا داوای لێ ئەکا کە خەفەت نەخوا و پێی‌ئەڵێ هەرچەند مریەم بمرێ کەس قات نیە جێی بگرێتەوە و ، هەندێکیش سەر و گوێلاکی مریەمی ناشیرین لە نامەکەیدا ئەکوتێتەوە .

ئەو سەردەمە بڕۆزی پایە و شکۆی خوسرەو ئەبێ . خوسرەو هەر هەوڵی ئەوەی ئەبێ شیرین بێ مارە بڕین خۆی بدا بەدەستەوە . بەڵام شیرین لەوە زیرەکتر و داوێن پاکتر ئەبێ وا بەئاسانێ بۆ خوسرەو هەڵخەڵەتێ . شەوێکیان لە دیوەخانی خوسرەودا ئەکەونە باسی کچی جوان کە کوێ کچی زۆر جوانی تیایە . هەر یەکێك باسی وڵاتێك ئەکا . یەکێك لە دانیشتوەکان ناوی ( شەکر ) ناوێکی ئەسفەهانێ دێنێ . خوسرەو کە ناوبانگی جوانێ و شۆخێی شەکری بۆ باس ئەکەن ئەچێ بە دڵیا و ئەچێ بۆ ئەسفەهان بیبینێ . لەوێ خۆی ئەگەیەنێتە لای و پاش هەندێ بەند و باو کە لەنێوانیانا ڕۆ ئەدا ئەیهێنێ .

لەگەڵ ئەوەشدا خوسرەو شیرینی هەر لە بیر ناچێ . پاش ماوەیەك سەودای شیرین ئەداتەوە لە کەللەی . بۆیە ڕۆژێکیان بە نیازی ڕاو دەرئەچێ و ئەڕوا تا ئەگاتە لای کۆشکەکەی شیرین . ئەیەوێ بچێتە ژورەوە ، بەڵام شیرین دەرگاکەی لە ڕوودا دائەخا و لێی ناکاتەوە . پاش پاڕانەوە و داوایەکی زۆری خوسرەو ، شیرین فەرمان بە کەنیزەکەکانی ئەدا لە کۆشکێکی‌کەدا جێی بۆ خۆش کەن و پاشان خۆشی ئەچێتە لای و گفتوگۆیەکی دوور و درێژ لەنێوانیانا ڕۆ ئەدا ئەنجامێکی ئەوتۆی بۆ بەجێهاتنی ئامانجەکەی خوسرەو نابێ . بۆیە خوسرەو تووڕە ئەبێ و ئەتۆرێ و دێتەوە بۆ ئۆردوگاکەی

خۆی و ئەو ماجەرایە بۆ شاپور ئەگێڕێتەوە . شاپوریش دڵی ئەداتەوە و پێی ئەڵێ سەبر بکا و خۆی ڕاگـرێ و سەرەنجام هەمو شتێ بە مرازی دڵی ئەو ئەبێ .

بێینەوە سەر باسی شیرین. ئەویش زیاتر دڵی پڕ ئەبێ لە داخ و خەفەت کەوا خوسرەو تۆرا و ، خۆی پێ ڕاناگیرێ بەدوایا ئـەڕوا و لەگەڵ سپێدەی بەرە بەیانا ئەگاتە ئۆردوگاکەی خوسـرەو . خوسرەو بە هاتنی شـیرین زۆر شادمان ئـەبێ . شیرین پێشـان ( نیکیسـا ) و ( بـاربود )ی گۆرانیبێژ و مۆسیقاژەن ئامادە ئەکا و هەندێ بابەتیان فێر ئەکا کە یەکەمیان بە زمـانی خۆیەوە و دوەمیان بە زمانی خوسرەوەوە بە ئاواز و مۆسیقاوە بیڵێن . کـە ئەم بەزم و ڕەزمە ڕۆ ئەدا و خوسرەو گوێی لەم ( شەڕە شیعری دلداری )یە ئەبێ هەر بە یەکجارێ کەڵکی لێ ئەبڕێ و خۆ کە پاش ئەوەی شیرینیش خۆی دەرئەخا خوسرەو بەتەواوێ هێزی تیا نامێنێ و لەبەر دەست و پێی شیرینا ئەکەوێ . ئەو شەوە تا سبەینێ بە خواردنەوە و ڕابواردن و ماچ و مۆچەوە بەسەرئەبەن ، بەڵام شیرین خۆی هەر نادا بەدەستەوە . خوسرەو ناچاری بڕیاردانی مارە بڕینی شیرین ئەبێ و پرس و ڕاوێژ بە گەورە گەورانی وڵات ئەکا و ئەوانیش قایل ئەبن و پیرۆزبایێ لێئەکەن و هەر ئەو شەوە ئەستێرەوان بانگ ئەکەن بەختیان ئەخوێننەوە ، بڕیار ئەدەن سبەینێ شایانی مارە بڕین و شایێ کردنە . بەمجۆرە خوسرەو خۆی کۆئەکاتەوە و کەلوپـەلی تەدارەکی شەکراو خواردنەوە و مارەبڕین ئامادە ئەکرێ و موغەکان بانگ ئەکەن شیرین لە خوسرەو مارە ئەبڕن و زۆر زۆ خوسرەو شیرین ئەگوێزێتەوە و بە مەرامی خۆی ئەگات .

لەم قۆناغە بـەدواوە کەف و کوڵی خوسرەو ئەنیشێتـەوە و هەمیشە لەگەڵ شیرین پێکەوە بە خۆشی ڕائەبوێرن و شیرینیش هەردەم ئامۆژگارێی خوسرەو ئەکا کەوا دادپـەروەر بێ و ئـاگادارێی ستەم لێکـراوان بکا . تا شەوێکیان خوسرەو لە خـەویا ئەبینێ شۆڕە سوارێك دێتـە ڕێی داوای لێ ئەکا دەست لە ئاگرپەرستێ هەڵبگرێ ، بەڵام خوسرەو ئەڵێ ئەگەر پارچـە پارچەشم بکەن دەست لە ئایینی باو و باپیرم هەڵنـاگرم . شۆڕە سوارەکە سەرە ڕمێك ئەکا بە سنگیا . خوسرەو لەتاوانا خەبەری ئەبێتەوە . بۆ سبەینێ خەوەکەی ئەگێڕێتەوە بۆ شیرین . شیرین ئەڵێ با بڕۆینە گەنجینە هەندێ زێڕ و زیو و نقێمی گرانبەها بێنین بیکەین بە خێر تا لەم بەڵایە بە دور بین . لە گەنجینەدا تۆمارێك ئەدۆزنەوە لەناو سندوقێکدا ، پێشانی گەنجینەدارەکەی ئەدەن بۆیان ئەخوێنێتەوە ، وەسـیەت نامەی ئەردەشێری بابـەکان ئەبێ بۆ

ئەوانەی پاش ئەو دێن کەوا پێغەمبەرێك لە مەککە پەیدا ئەبێ ناوی موحەممەدە و ئەبێ ئیمانی پێ بهێنن . خوسرەو بە دیتنی خەتەکە و بە بیستنی قسەکانی گەنجینەدارەکە موچوڕکەیەك بە لەشیا دێت . شیرین باوەڕ بە ڕاستیی ئەوەی لە تۆمارەکەدا نوسراوە ئەکات ، بەلام خوسرەو ئەڵێ ڕۆم نایەت دەست بەرداری ئاینی باو و باپیری خۆم ببم . هەرچیشم دێتە ڕێ ، چش با بێ !

زۆری پێ ناچێ کاغەزی پێغەمبەر ( د ) ئەگات بە خوسرەو ، داوای لێ ئەکا موسولمان بێ . خوسرەو بە شێوەیەکی ناشیرین وەڵامی فروستادەکەی پێغەمبەر ئەداتەوە . بۆیە پێغەمبەر کە بەمە ئەزانێ دوعای شەڕی لێ ئەکا و زۆر ناخایەنێ نیشانەی نەگبەتیی خوسرەو دیاری ئەدا . شیرۆیەی کوڕی دڵی ئەچێ لە شیرینی باوەژنی و پیلانێك بۆ کوشتنی باوکی ئەنێتەوە ، دەس و پێوەندی دەربار و پاسەوانەکانی باوکیشی قایل ئەکا کە دەست نەهێننە ڕێی . شەوێك ئەچێتە سەر جێگەکەی باوکی و ئەیداتە بەر خەنجەر ساردی ئەکاتەوە . شیرین بە کوشتنی خوسرەوی مێردی وەزعی زۆر ناخۆش ئەبێ ، لە خەفەتا ئیسراحەتی لێ ئەبڕێ .

شیرۆیە پاش کوشتنی باوکی ئەچێتە سەر تەخت و گەورە گەورانی وڵات کۆئەکاتەوە و هەندێکیان لێ ئەکوژێ و هەڕەشە لەوانیکەشیان ئەکا کەوا هەرکامیان توزێ نیشانەی ملپێچیی لێوە دیاریێ بدا لە ملی ئەدا و بە دەردی ئەوانیکەی ئەبا . ئەوانیش ناچار هەمو سەری بۆ ئەخەوێنن و ئەبن بە پیاوی .

شیرۆیە ، وەك وتمان بە تەماعی داگیر کردنی شیرینی باوەژنی باوکی کوشت . بۆیە ئەنێرێ بەدوای شیرینا و ڕازی دڵی خۆی بۆ دەرئەبڕێ . شیرین هەرچەند ئەلالێتەوە لالانەوە سوود نادا . ناچار داوای مۆڵەتی چل ڕۆژ لە شیرۆیە ئەکا گوایە تا ئەو چل ڕۆژە پرسە ئەگرێ بۆ خوسرەو . شیرۆیە مۆڵەتی ئەداتێ و خۆی ئەچێ بۆ ڕاو . پاش چل ڕۆژەکە دێتەوە ، ئەنێرێتەوە بەدوای شیرینا . ئەمجارە شیرین داوای هەندێ شت لە شیرۆیە ئەکا کە تا نەیانکا شوی پێ ناکا . وەك ڕۆخاندنی کۆشکەکانی باوکی و پەی کردنی ئەسپ و ماینە چاکەکانی و دابەش کردنی سامانی و قەلاچۆ تێخستنی مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژەکانی . شیرۆیە پێی هەڵئەخەڵەتێ و هەمو داخوازییەکانی بۆ دێنێتەدێ . شیرین ئەچێ بۆ گەرماو خۆی بشوا و خۆی ئارایشت بدا گوایە بە بوکێ ئەبرێ بۆ شیرۆیە . لە ڕاستیشدا خەیاڵێکیتری لە کەللەدا ئەبێ . شیرۆیە ئاگای لە هیچ نابێ ، شیرین پاش خۆ شتن و

جل‌گۆڕێن کەنیزەکەکانی کۆئەکاتەوە ، ڕاستیی مەسەلەکەیان تێئەگەیەنێ و ماڵاواییان لێ ئەکا . کەنیزەکەکان هەرچەند ئەگرێن و ئەپاڕێنەوە کە خۆی نەکوژێ ، داد نادا . شیرین ئـەلێ پاش خوسرەو لەگـەڵ کەس سەر نانێمە سەر سەرێن . ئەمە ئەلێ و فەرمان ئەدا مایـنـەکەی بۆ زێن ئەکەن ، سوار ئەبێ ئەچێ بۆ سەر گۆڕی خوسرەو .

لەسەر گۆڕی خوسرەو جارێکی‌کەش ، وەك شەوی کوشتنەکەی ، وەك ئەو ڕۆژەی بە زۆر بەکێشیان کرد بۆلای شیرۆیە ، بەکوڵ ئەگرێ و بەسەر خوسرەوا هەڵئەدا . ئەنجا خەنجـەرەکەی کە لەژێر سوخـمەکەیدا قایمی کردبو دەری‌دێنێ ، مشتوەکەی لەنـاو خاکا قایم ئەکا و بە گـوڕ سنگی ئەدا بەسەر نوکەکەیا و بەوجۆرە خۆی ئەکوژێ ، ناوی وەفا بۆ خۆی و بەدناوێ و حەرامزادەییش بۆ شیرۆیەی هەنەزای تۆمار ئەکا .

کە شیرۆیە بەمە ئەزانێ ئەدا بەسـەری خۆیا . هەست ئەکا چ ئاخـر شەڕییەکی بۆ مایەوە . ئەداتە کەژ و ئەچێ لە هەزار بە هەزارێکەوە خۆی هەڵئەداتە خوار ، هەپرۆن هەپرۆن ئەبێ . بە هەزار حاڵ هەندێ پارچـەی لەملا و لەولاوە کۆئەکەنەوە . ئەویش و شیرینیش لەپاڵ خوسرەودا بە خاك ئەسپێرن .

بەم‌جۆرە پەردە بەسەر کارەساتی یەکێ لە بەسـوزترین دلداریەکانی مێژوودا ئەدرێتەوە ...



بسم الله الرحمن الرحيم

به نام ئەوکەس (شیرین) ئەرمەن
پەیدا کەرد ، (فەرهاد) پەیش بێ بە کۆ کەن
هەر سوب تا ئێوار نە پای (بێستون)
تەقەقەی قولنگش یاوا بە گەردون

نە ڕاش چەندین جەور ، چەند جەفا بەردش
ئاخر بە ناکام ئەروا سپەردش
(تعالی) جە صونع پەروەردگاریش
جە کار شیرین شیرین کرداریش

ساقیی تەقدیرش بە شیشەی لەب ڕێز
گەردەن بە شەراب عەشق شۆر ئەنگێز ،
پەی نەظەربازان جە عەرصەی زەمین
ئاراست بیساطێ بە زەوق شیرین

منۆشان پێشان پەیاپەی پەیوەست
بەتەرتەر جە (قەیس) فەرهاد موان مەست
ئافەرین جە ذات بەخشندەی بەخشان
چ خاس بە خاصان خاس پێ مبەخشان

سەعی صەد ساڵەی شێخان کامڵ
بە نیم نیگاهێ مکەران باطڵ
ئەگەر ڕەزا بۆ صۆفیان صاف
ماوەرۆ بە دەس بێ درۆ و گەزاف
بەو دەستوور کەردەن شیرین شێوەشان
صەد کەس چون فەرهاد بیەن لێوەشان
وستەن نە ماڵەم شۆر عەشقشان
هەر جەفاو جەورن دایم مەشقشان
دیدەی مەستشان نە ڕۆی عەرصەی دەور
ڕشتەن بەی سورمەی نەزاکەت بەی طەور
شەرابێ بەی طەور (خانا)ی مەینەتبار
جە مەیخانەی عەشق خانەی مەینەتبار
جە لوطف و ئیحسان شەهریاریی وێش
منۆشا بادەی خۆش گەواریی وێش
دەرحاڵ جە شادیی مەست مبۆ سەرشار
ماوەرۆ بە ڕەقص خامەی عەنبەربار
تا کە بوازۆ جە مەحشەر شەفاش
نەدەران بە نار جەهەننەم سزاش[1]

* * *

(١) لە سەرەتاوە تا ئێرە لە نوسخەی (أ) دا نیە .

یاران ئەز کۆن میشکێن خامەیێ
کۆن قەڵەم بە دەس ، بۆ شانامەیێ[2]
جە[3] مەدداحێی ذات شای ( خیر البشر )
شەفاخوای ئومەت ڕۆی دەشت مەحشەر
چون شاپوور چێن نەقش عەنبەرێن[4]
شیرێن‌تەر جە خاڵ بۆ میشک شیرێن
بکێشۆن[5] بە ناز ئارۆ بە ضەرۆر
جە سەواد میشک ، جە لەوح کافوور
مەعلوم بۆ جە لای ڕەهرەوان دێن
عولەمای[6] ئومەت ( فخر العالمین )
هەرکەس چون خوسرەو طەبعش لاڵ پۆشەن
جە مەیخانەی پیر موغان مەی نۆشەن
ئیسا هەرکەسێ گەوهەر فرۆشەن
جە وەصڵ شیرێن ویش شەربەت نۆشەن[7]

---

(٢) نیوەی دووەمی ئەم شیعرە لە نوسخەی ( ب )دا بەم جۆرەیە :
کۆن قەڵەم دەوات بۆ شەمامەیێ

(٣) جە ( ب ) بە .

(٤) نەقش عەنبەرێن ( ب ) نەققاش دێرێن .

(٥) بکێشۆن ( ب ) مکێشۆن .

(٦) عولەمای ( ب ) شەفاخوای .

(٧) نیوەی یەکەمی ئەم شیعرە و نیوەی دووەمی شیعری پێشەوەی لە نوسخەی ( ب )دا نیە و لە نیوەی یەکەمی شیعری پێشەوە و نیوەی دووەمی ئەم شیعرە شیعرێك دروست بوە .

گا چون ( نیظامی )[٨] ، گا چون ( مەولەوی )[٩]
گا وێنەی ( خوسرەو )[١٠] شوعەرای دەهلەوی

مکەرۆ جە وەصف ( خیر للرسلین )
میخلات پڕ میشك خەتا خەط چین[١١]

بە شنۆی نەسیم خامەی بۆ[١٢] سونبول
مشکاوۆ[١٣] غونچەی تەعریف چون گوڵ

جە وەنەوشەی وەصف ذات ئەو سەروەر
مکەرۆ پڕ عەطر عەرصەی هەفت کیشوەر

پەی چێش ؟ ئەو ڕەسوڵ قورەیشی لەقەب
خەطیب سەرخێڵ خوطەبای عەرەب[١٤]

---

(٨) نیظامی : نیظامی‌ی گەنجەوی ، خاوەنی ( خەمسە )ی بەناوبانگە کە یەکێکیان ( شیرین‌و خوسرەو )ە .

(٩) مەولەوی : مەولانا جەلالەددینی رۆمی خاوەنی ( مەثنەوی ) .

(١٠) خوسرەو : ئەمیر خوسرەوی دەهلەوی . خوسرەو ( ب ) باقی .

(١١) نیوەی دوهەمی ئەم شیعرە لە نوسخەی ( ب ) دا بەمجۆرەیە :
موحەللات بەو میشك خەططاط خەط شیرین

(١٢) بۆ ( أ ) بۆی .

(١٣) مشکاوۆ ( أ ) شکاوا .

(١٤) ئەم شیعرە لە نوسخەی ( ب ) دا بەمجۆرەیە :
بواچۆن جە مەدح قورەیشی نەسەب
خەطیب‌و سەرخێڵ طایفەی عەرەب

هەروەها شیعری داهاتووەوە لەو نوسخەیەدا نیە تا ئەگانە شیعری ( جیبرائیل چەنی مەلائیك بە دەو ) لە باسی ( میعراج نامە ) دا . بڕوانە =

کەعبەی موعەظظەم عەرصەی ئافاقەن
هەشت بەهەشت بە دیێ دیدەش موشتاقەن
جێ وەرتەر گرتەن عەصای مۆسەوێ
وە گیسۆش ئیعجاز زانای مەعنەوێ
( ليلة المعراج ) ئەو ( قرة العين )
کەرد بە تاج عەرش موعەظظەم نەعلەین
شەمێم گوڵزار شەرعش بێ خیلاف
موعەططەر کەردەن جە قاف تا بە قاف
چون طەنطەنەی تەپڵ شاهان جەم طەرز
صەدای دارو گیر نە عالەم بێ بەرز
نەعرەتەی ( لولاك ) شەرەفنامەی ئەو
بەرزەن چون صەدای کۆس کەیخوسرەو
عەزیزەن بە نەص ( لعمرك ) ذاتش
ئەیلا بە وەصف قەڵەم صیفاتش
( خانا ) بە سەرگەرد بەرز پایەش بۆ
بە فیدای ڕەوضەی فەڵەك سایەش بۆ
عەرض وەصف ذات ( ختم الانبیا )
تا بە ئینقیراض ئەی دەور دنیا

---

= کۆمەڵە شیعرێك لە نوسخەیەکداو نەبوونی لە نوسخەیەکیترا نیشانەی ئەوەن کە دانەر خۆی بە چەند شێوەی جیاجیا نوسیویە ، چونکە لە یەکخستنی دوو نوسخەکەی بەردەستمانا گەلێ مەبەست دووبارە ئەبێتەوە .

ئەیۆ نە ضەبط خامەی خۆش تەقریر
بەی چێش ؟ کە ذاتش نەدارۆ نەظیر
ئیسە تۆیچ هەردەم شوعەرای دڵ پەسەند
سوخەن سەنج ، نەظم شیرین‌تەر جە قەند
جە شەربەت خانەی مەدح ئەو سەروەر
توتی‌ی خامەی وێت شەکەر سوخەن کەر
با جەلای شیعرت شیرین زەونەق بۆ
چون دوعای خاصان مەقبوڵ حەق بۆ
( عزیز القدر )ی ئەو چون ( نیظامی )
بپەرسۆ تەئرێخ ئەی نامەی نامی
( غەین )و ( قاف )و ( نون ) ، ( جیم ) کەرۆ حیساب [15]
لێش مبۆ ڕەوشەن چون قورص ئافتاب

* * * *

---

(١٥) ئەم تیپانە بە ژمارەی ( تیپەکانی ئەبجەد ) ئەکەنە ١١٥٣ی هیجری .

# میعراج نامە[1]

شەوێ وێنەی شەمع تەجەللای کلۆی طور
عەرصەی سەرزەمین ڕەوشەن بێ جە نور

چەتر چنین چەرخ چون دێبای گوڵ دۆز
مدرەوشا جە دوڕ نجم شەب ئەفرۆز

توراب تیرەی ئەرض عەنبەرین
مبەخشا شۆڵەی شەمس خاوەرین

سەقف زەیبەقێی چەرخ زەڕبەفت پۆش
گوڵ گوڵ بە ئەنجوم وێنەی گوڵ فرۆش

نەسیمش بۆی زوڵف شیرین مبێزا
جەوهەرش بۆی میشك خوتەن مخێزا

ئەو شەو مەر حامیل وەحی ڕەببانێ
جە دەوڵەت سەرای ڕای ( ام هانی )

واتەن پێش : سەیید صەومەعەی ئەفلاك
بەی طەور ئەمرشەن قەییوم بێباك

چەنێ چەندین فەوج ( اعلی علیین )
بشی وە پای تەخت ( رب العالمین )

---

(١) ئەم سەرباسە تەنها لە نوسخەی (ب)دا هەبێ و لە شوێنێکی نەگونجاویشدا دانرابێ ، ئێمە خۆمان گواستمانەوە بۆ ئێرە .

واچه پێش هەی نوور بورج فوتووەت
موتەووەج بە تاج ئالآی نوبتووەت[٢]

پۆسە ڕەزاشەن پادشای کەونەین
تەخت عەرش کەری بە فەرش نەعلەین

جەودما بە ئەمر بێنای بیهتەرین
خازن بەهەشت جە ڕەوضەی بەرین

چەنێ بوراقێ چون بەرق ئەنجوم
ئادەمێ صوورەت ، شۆخ ، طاوس دوم

سم قورص یاقوت ، سیای پڕ شەفاف
ناڵ نوقرەی ئەبیەض ، مێخ مرواریێی صاف

باڵ خەیاتەی خام ، خۆش ڕەنگ بێ خەوش
وەش بۆتەر جە وەڵك وەنەوشەی وەنەوش

لوجام لاجیوەرد ، سینەبەند جە نوور
ڕەشك طوڕڕەی زوڵف پڕ گرنج حوور

---

(٢) لام‌وایە ڕاستەکەی لەجیاتێی ( واچە ) ( وانەن ) بێ ، چونکە (واچە) لەم شوێنەدا دەست نادا . مەعنای ئەم شیعرەو شیعری پاشەوەی لە چەشنی مەعنـای دوو شـیعرەکەی پێشبانەو ، مەعنایەکی تازەی‌وایان تیـا نیـە باساوی بوونیان بدا لەپاڵ دوو شیعری پێشوودا . بەمەدا وادیارە (خانا) لە پەراوێزی کتێبەکەیدا نووسـیتێ تا پاشـان لەگەڵ دوانەکەی بەرو بەراوردیان بکا ، ئەنجا کام جوونیانی بە جوانتر زانی ئەوەیان دانێ و ئەویان هەڵگرێ ، بەڵام لەپاشا نووسیار خستبێتیە ناو کتێبەکەو بەوجۆرە جێگیر بووبێ .

زێن جه یەك پارچەی لەعل بەدەخشان
تەنەشان جه یەشم مرواریو مەرجان
جه فیکر ئەصحاب هەستیی خۆشتەر
طەی مکەرد ساتێ نه چەرخ ئەخضەر
جیبرائیل چەنی میکائیل[3] به دەو
ڕاهی بێن به ڕا کێشاشان جلەو[4]
به تەکبیر گۆیان ومر جه صوب شەبەق
شێن وه پای سەریر ڕەسول بەر حەق
ئەوشەو نه حوجرەی جای (ام هانی)
میهمان بی ڕەسول حەیی رەببانی
ئاخر به صەد عیزز ، به صەد ئیحتیرام
(مبلغ الوحی علیه السلام)
به میروەحەی باڵ قورس بۆ عەنبەر
بێدار کەرد جه خاو سالار مەحشەر
واتش : (یا سید ، لعمرك) مەقام
طەڵەبکار تۆن[5] (حی لاینام)
پەرێ سواریت بوراقێ جه نور
کیاستەن جەناب پادشای غەفور

(٣) میکائیل (ب) مەلائیك .
(٤) کێشاشان جلەو (ب) ئامان به یەك شەو .
(٥) تۆن (ب) ذات .

ئێد کە شنەفتش شای ( بدر الدجی )
بەصەد شادێ و زەوق هۆرێزا وە پا
قۆڵش گرت جەناب جوبرەئیل بە ناز
سوار بێ حەبیب حەی بێ‌نیاز [٦]

ئیسرافیل چەنێ مەلائیك بە دەو
گرتشان ڕیکاب هومایۆن ئەو
وێنەی غوڵامان حەڵقەی دوڕ نە گۆش
کێشاشان قودسێ غاشیەش بە دۆش

زومرەی صەبۆحێ گرد بێ [٧] تەمام
وێنەی مەشعەڵدار [٨] شاهان جەم جام
جوبرەئیل چەنێ مەلەء ئەعلا
ڕۆشان کەرد نە ڕای ( مسجد الاقصی ) [٩]

ڕۆح هومایۆن ئەنبیا و ئادەم
ئامان وە پێشواز [١٠] سەیید خاتەم

---

(٦) ئەم شیعرە لە نوسخەی (ب)دا بەم‌جۆرەیە :

قوبوڵ کەرد بە ناز پێغەمبەر ئەو ڕاز
سوار بێ وە ئەسپ حەیی بێ‌نیاز

(٧) گرد بێ (ب) یەکسەر بە .
(٨) وێنەی مەشعەڵدار (ب) بە وێنەی مەشعەل .
(٩) ئەم شیعرە لە نوسخەی (ب)دا نیە .
(١٠) ئامان وە پێشواز ( أ ) کەردن ئیستیقباڵ .

رەسوول نە ئەوشەو بێ وە پێشواشان
ساتێ[11] تێشت بە عەیش عوشرەت جە لاشان
دیسان[12] سوار بێ وە پشت بوراق
یاوا بە ئەیوان[13] گەردوون شەش تاق
سەبعەی سەییارە چەنێ ماه و خوەر
کەردشان پابوس سەیید سەروەر
بەرجیس‌و ناهید ، کەیوان‌و بەهرام
بە خەطط شەریف عەطارید تەمام
سپەردن بە ئەو بزورگی‌و نامێ
بە چەند ئیحتیرام نامێ‌و گیرامێ
میرریخ زیکابش بوسا بە ئیعزاز
پەی نەصرش هەم نەسر طایر کەرد پەرواز
جە رەنگ ئامێزێی رەیحان ئەی باغ
نیا نە دیدەی ویش سورمەی (مازاغ)[14]
سا وەختێ طەی کەرد بە فەضڵ بێچوون
صەد هەفت ئەورەنگ چەرخ بێ‌ستوون
بە تەئییید ذات حەیی بێ‌هەمتا
تەشریف بەرد بە صەدر سیدرەی مونتەها

---

(11) ساتێ (أ) چوگە .
(12) دیسان (أ) ئاخر .
(13) ئەیوان (أ) ذمروەی .
(14) ئەم شیعرە لە نوسخەی (ب)دا نیە .

جوبره‌ئیل چۆگه به خاطر مه‌لۆل
عه‌رض کەرد به پایه‌ی سه‌ریر ڕه‌سۆل
وات : ئەر من چه‌نی تۆ بیۆن ڕاهی
مسۆچۆن به نور ذات ئیلاهی

تا ئاخر ڕه‌سۆل سه‌یید سه‌روه‌ر
جه سه‌واد عه‌رش ئه‌عظه‌م کەرد گوزه‌ر
مه‌حره‌مان غه‌یب گشت میننه‌ت به‌ردن
ڕه‌فره‌فێ جه نور په‌رێش ئاوه‌ردن
سوار بی چلۆگه به ڕه‌فره‌ف هه‌ی کەرد[15]
ڕاکه‌ی پانصه‌د ساڵ لامه‌کان طه‌ی کەرد

وه‌ختێ به ذه‌روه‌ی لامه‌کان یاوا
لەرزا جه هه‌یبه‌ت هه‌تاکه تاوا

ئاما نیدا لێش نه په‌رده‌ی ئه‌سرار
واتن : ( لاتخف ) سه‌یید موختار[16]

عه‌رض کەره دوعات ( یا خیر الانام )
به سووردایقات ( حی لاینام )

ڕه‌سۆل به جه‌ناب صه‌نعه‌ت ساز فه‌رد
هه‌رچی بی مه‌طلەب سه‌راسه‌ر عه‌رض کەرد

---

(۱۵) هه‌ی کەرد ( ب ) چون کەرد .

(۱٦) ئه‌م شیعره‌و شیعری پێشه‌وه‌ی له نوسخه‌ی ( ب )دا نین .

شای (کثیر اللطف) بێهەمتای وەهاب
جە ڕای مەرحەمەت کەردش موستەجاب
هەم ئەوشەو[17] قەیبوم فەرد بێ ئەندێش
یاوناش دەرسات بە مەقام وێش
ئومێدم بە ذات بەخشندەی داوەر
(خانا)ی خەم خەیاڵ زام دڵ خەطەر
ببەخشۆ گوناش جە عەرصەی مەحشەر
بەو شەمع میحراب ڕەسوڵ سەروەر

* * *

یا ڕەب[18] بە فیراق فەرهاد کۆ کەن
بە خورشێد حوسن شیرین ئەرمەن
بە ئیستیلای عەشق خوسرەو و پەروێز
بە خۆش خورامی گوڵ گوون و شەبدێز
بە خامەی میشکین شاپور چینی
بە ناز شیرین، بەو نازەنینی
بە ساز و بە لەحن شۆخ (نیکیسا)
بە نەییر ئاهەنگ موعجیزەی عیسا
بە طوغیان دەرد بێ دەرمان عەشق
بە طۆفان سەدد ئەسر مەینەت مەشق

(17) ئەوشەو (ب) شەو بێ .
(18) ڕەب (ب) حەی .

وێنەی ( نیظامی ) صەیقەل دەر زەینم
بە سورمەی دانش ڕەوشەن کەر عەینم

تا کە ماجەرای شیرین و خوسرەو
سەنگ‌تاشی فەرهاد ، سەرگوزەشت ئەو

باوەرۆن وە نەظم خاستەر جە گەوهەر
بە ڕەشح خامەی شۆخ بۆ عەبەر

جە لای عاقلان صاحیب عەقڵ و دین
دانا بزورگان کوردستان زەمین[19]

ڕاستەن مواچان فارسی شەکەرەن
کوردی جە فارسی بەڵ شیرین‌تەرەن

پەی‌چێش ؟ نە دەوران ئەی دنیای بەدکێش
مەحظوظەن هەرکەس بە زوبان وێش

مەعلومەن هەرکەس بە هەر زوبانێ
بواچۆ نەظمێ جە هەر مەکانێ

وێنەی عوروسان زێبای میشک چین
بکەرۆش جە حوسن عیبارەت شیرین

خاریج جە مەعنی نەبۆ مەضمونش
کریابۆ چون شیعر (جامی) مەوزونش

---

(١٩) لەم شیعرەوە تا شیعری ( بە ڕەشح خامەی میشکین بۆ عەبیب ) لە نوسخەی ( أ ) دا نیە .

جه لای خیرەدمەند دڵ پەسەند مبۆ
شیرین‌تەر جه شەهد شیرەی قەند مبۆ
جه عەرصەی دنیای دوون بەدفەرجام
بە دەستوور نەظم (نیظامی) مەقام
بە لەفظ کوردی کوردستان تەمام
پێش بـوان مەحظوظ . باقی (والسلام)
مونشی‌ی ئەی ئینشای شیرین‌تەر جه قەند
بەی طەور تەحریر کەرد نەظم دڵ پەسەند
ئەورۆ کە خامەی عەنبەر شەمامە
وەش‌بۆ کەرد جه میشك ئینشای ئەی نامە
تەئریـخ هیجرەت (ختم المرسلین)
موطیـع دیوان شەرح شەرع و دین
ڕۆی دوشەممە بی (ذی‌حجه الحرام)
هەزار و پەنجا و یەکصەد سێ تەمام
ناگا جه وەختێ میێنای صوبح دەم
جه جام خورشێد ڕەوشەن بی چون چەم
جه پەردەی ئەسرار لامەکان ماوا
سرۆشێ بەی طەور بە گۆشم یاوا
واتی : هەی شوعەرای خۆش نەظم و شێوە
جانشین قەیس پەی لەیلا لێوە

چێش مبۆ چون نەظم (نیظامی)ی دوڕ سەنج
بە لەفظ شیرین ، بە بێ لارە و لەنج

جە وەصف فەرهاد شیرین و پەروێز
باوەری بە ڕەقص خامەی عەنبەر بێز

عەیبەن پەرێ تۆ دانای زەڕ شناس
دەمێ چون صەڕڕاف یاقوت و ئەڵماس

جەی بازاڕ عەشق جە ڕای پڕهۆشی
مەشغوڵ بی بە کار جەوهەر فرۆشی

حەیفەن وێنەی تۆ جەواهیر بارێ
نەکەرۆ پەی وێش ڕەنگین بازارێ

خاطرت جەم بۆ جەوهەریی لاڵ سەنج
دانای دوڕ شناس ، گەنجوور کۆی گەنج

هەرکەس وێنەی تۆ گەوهەر بارشەن
داناو بزورگان خڕیدارشەن

گوشاد کەر زوبان جەواهێر بارت
تا گەرم بۆ ظەریف سەودای بازارت

وەرنە جە دەوران تۆ جە بێکاری
عومرێ بە زایە و بە پوش موباری

سفارش ئێد بی یا کەردم تەمام
(سلام علیك) باقی (والسلام)

بەندەیچ (حسب الامر) ئەو سرۆش غەیب
بە ڕەشح خامەی میشکێن بێعەیب
بەی طەور کەردمان ئەی نامەی نامێ
ئینشا بە دەستوور نەظم (نیظامێ)
ئومێدەن بە ذات دانای شیرێن کار
مەضموون ئەی نەظم جەواهێر نیگار
چون ڕاز شیرین نادیرەی ئەبیام
شیرێن بۆ بە کام کافەی خاص و عام

* * * *

# تولد شدن خسرو[١]

شوعەرای شیرین نەظم ، شەکەر[٢] ڕێزەی ڕاز
شێخ ( نیظامی ) طەور ، ( شەفیما )[٣] ئەنداز

بە ڕەشح خامەی میشکین چون ( مانی )
بەی طەور ئینشا کەرد[٤] لەوح مەعانی

چون بە ( حسب الامر ) قەدیم لامەوت
نەوشیروان نۆشا مەی جە شیشەی فەوت[٥]

بە ویفق[٦] تەوفیق ذات ئیلاهی
هورمز نیشت نە تەخت فەڕبەخش شاهی

بە ڕەسم ئایین نەوشیروان پێش
مەعمور کەرد بە عەدڵ ویلایات وێش

---

(١) لەدایکبونی خوسرەو . ئەم سەرباسە تەنها لە نوسخەی ( ب ) دا هەبو ، لەوێیش لەسەر شیعری پاشتر دانرابو ، وامان بە جوان زانی پێشی خەین و بیهێنینە ئێرە .

(٢) شەکەر ( ب ) شیرین .

(٣) شەفیما ( ب ) ئەرەستو .

(٤) ئینشا کەرد ( أ ) کەرد ئەفشان .

(٥) نەوشیروان .. تاد ( ب ) نەوشیرەوان شا نۆشا بادەی فەوت .

(٦) ویفق ( ب ) حوکم .

کافڤەی[٧] مەساکێن دەور ڕۆزگار
جە حوسن سولوّک ئەو فەڕڕوخ تەبار
هەر ڕۆ تەپڵ عەیش عوشرەت مژەندن
دوای ( گەنجەلەرش ) پەرێش موەندن
بەڵێ ئەو جەمشێد کەیخوسرەو نگێن
غەیر جە فرزەندێ نە ڕۆی سەر زەمێن
جە عەرصەی دەوران وێنەی ئەسکەندەر
هێچش کەم نەبێ جە گەنج و گوهەر
ئاخر خوداوەند بەخشندەی بێچوّن
کەریم بێباک ، کار ( کن فیکون )
بە فەضڵ عەمێم لامەحصوّر وێش
فرزەند عەزیز فەرزانە دا پێش
فرزەند ، کام فرزەند ؟ فەڕڕوخ سەرێرێ
( رفیع القدر )ێ ، ڕەوشەن ضەمیرێ[٨]
گیرامێ دوڕڕێ جە بەحر شاهێ
شەمعێ جە ئەنوار ذات ئیلاهێ
شەهەنشا جە زەوق ئەو ( قرة العین )
ئەو ( قوة الظهر ) ظەریف[٩] پڕ زەین

---

(٧) کافڤەی ( أ ) عەجەزەی .
(٨) ئەم شیعرە لە نوسخەی (ب)دا نیە .
(٩) ظەریف (ب) مەحبوّب .

شکاواش جه باغ دەروَن غونچەی دڵ
سوجدەی شوکرش بەرد ، خەندان بێ چون گوڵ

فەرماش تا چل ڕۆژ بە صەد شادیێ و ناز
ژەندن بە ئاهەنگ[10] (عیراقێ) و (حیجاز)

جه شادیێی فرزەند شۆخ مەهپارەش[11]
ناڵەی نای زەڕڕێن نرفەی نقارەش[12]

زڕەی جام سەنج ، شیخەی شەیپوورش
صەدای ڕۆیین کۆس ، زەمزەمەی شوورش

مویەرد نە سەواد نۆ تاق ئەخضەر
خاستەر جه ڕۆی ڕەزم دارا و ئەسکەندەر

جەودما ئەصحاب (زیج) و (ئوستورلاب)
ئەختەر شناسان ئەرەستو خیطاب

سەیر زایچەی طالیعش کەردن
وە لای شەهەنشاه مەصڵەحەت بەردن

واتن فرزەندت فەڕڕ شاهیشەن
نیشانەی دەوڵەت مەه تا ماهیشەن

جەو بۆن بزورگان بەزم بەهەشت بێز
نامشان نیا (خوسرەو پەرویز)

---

(١٠) بە ئاهەنگ (ب) ئاهەنگان .
(١١) مەهپارەش (أ) مەهپارش .
(١٢) نقارەش (أ) گوفتارش .

فەرماش شەهەنشای بەور دەریا دڵ
ئاوەردن شەخصێ چۆبتاش[13] قابڵ

بە چەند ڕۆ چۆبتاش ئەو دانای پەیکەر
تاشا بێشکێ تە نیشان زەڕ[14]

بەرد نە کەمانش چەند یاقوت لاڵ
تەختش ڕەنگین کەرد بە شەنگەرف ئاڵ

دارچەی دێبای خارایێ گوڵ زەڕ
بەن دەزراچە جە یەشم و دوڕ پەڕ[15]

سەربێشک پەرێش ئۆسای خەتایێ
وراست جە زەڕبافت زەمێن[16] تەلایێ

ناز باڵشت جە چێت خاصەی قەڵەمکار
دۆشەک جە سەنجاب سڵسەنێی زەڕتار

دایەی سێم ئەندام سەمەن بۆ ئەنداز
تەدارەک کەردش پەرێش بە سەد ناز

---

(13) چۆبتاش ( ب ) نەجار .

(14) ئەم شیعرە لە نوسخەی ( ب )دا بەمجۆرەیە :

بە چەند ڕۆ نەجار دانای هونەروەر
تاشاش گەهوارەی تە نیشان زەڕ

(15) ئەم شیعرە لە نوسخەی (ب)دا نیە .

(16) زەمین (ب) خاصە .

بەوطەور کەرد نەققاش ئەی نەقش دێرین
طورڕەی نەوعورووس سوخەن عەنبەرین
پەی خوسرەو بە گەس والیدەی پاك دین
دانای بەڵقیس قەدر مەریەم ئاستین
گەووەڵ کڵاوی جە زەڕبافت تاس[17]
وراستن پەرێش ئوستادان خاس[18]
بازوش دانە بەند مرواری کەردن
نە ڕوی حاشیەش زومەڕڕەد بەردن
پەرلی لورتاخش زەڕگەران بە تاو
زەڕکاریش کەردن[19] دانای متو شکاو
سەرلولەش جە لاڵ دانەی بەدەخشان
ڕەخشانتەر جە قورس ڕەخشندەی ڕەخشان
تەخت جە یەك پارچە یاقوت بوم زەرد
تە نیشان بە دوڕ فەیروزەی بێگەرد
نیاشان نە فەرق پەرویز خوسرەو
درەخشا سەواد چون ستارەی شەو
کەردشان پێشدا دەستەی طاوس پەڕ
شیرینتەر جە تاج تۆمار گوڵ زەڕ

(١٧) تاس (ب) تاك .
(١٨) خاس (ب) پاك .
(١٩) زەڕکاریش کەردن (أ) زەڕگەر کام زەڕگەر .

کرباسێ بۆ میشك تافتەی تەمام ئاڵ
قەبایێ جە لاڵ ، شەوخاوێ جە لاڵ

پۆشاشان بە سەوڵ قامەتش بە ناز
پۆل نەوهالاّن[20] شەکەر رێزەی ڕاز

دایانش پێچاش بەو حەریرەوە
بە دێبای زەربافت بۆ عەبیرەوە

نیاش نە بێشك ، بێشك وێنەی خۆر
درەخشا نە مەهد گەردوّن ئەخضەر

فراوان بە ناز ڕەنج چەنێش بەردن
بە شیرو شەکەر پەروەردەش کەردن

هورمز هەر ساعەت وێنەی غونچەی[21] گوڵ
بۆ منیا نە بلاش بە دڵواز دڵ[22]

پەی چێش ؟ کە فرزەند بێنایێ عەینەن
مەشطەی ڕەوشەن[23] ئاینەی زەینەن

غەرەز ، تا ئەو طیفل نەوخێز ساوا
سینن شەریفش بە چاردە یاوا

---

(٢٠) نەوهالاّن ( أ ) نازداران .

(٢١) وێنەی غونچەی ( أ ) چون غونچەیێ .

(٢٢) بە دڵواز دڵ ( أ ) وێنەی دەستەی گوڵ .

(٢٣) ڕەوشەن ( ب ) ڕۆپۆش .

هەر ڕۆ زیاتەر مبق شوعڤورش
خۆر مبق خەجڵ جە شوعلەی نوورش

وەختێ پەخش مبق کاکۆڵ نە پێڵش
مبق صەد شیرین گەرمەێ وێڵش

دایم هەر ئەدەب شاهێ بێ مەشقش
شێت مبق یۆسف کەنعان جە عەشقش

تەتەنەی زانش وێنەی (توهەمتەن)
میاوا بە موڵك خەتا تا خوتەن

جە سامش بە فەضڵ ذات ئیلاهێ
ملەرزا پای گاو جە پشت ماهێ

خەدەنگش مویەرد جە کلای سەنگ خار
چون نەسیم جە لول حەڵقەی زوڵف یار

مشکاوا شمشێر بڕندەش حەجەر
چون سینەی عاشق نە ئەبرۆی دڵبەر

* * *

ئەصحاب تەئریخ ئەی شیرین نامە
بەی طەور دا جەولان کومەیت خامە(٢٤)

---

(٢٤) ئەبوو ئێرە سەرباس بوایە ، چونکە لێرەوە باسی مامۆستا گرتنە بۆ خوسرەو . ژەنگ بێ یا لەبەر کورتێی باسەکە سەرباسی بۆ دانەنرابێ ، یا نوسیار پەراندبێتی . بۆیە ئێمە بەم ئەستێرانە جیامان کردەوە

هورمز شا کە دیش فرزەندش بەی طەور
هەمتاش کەس نیەن نە ڕۆی عەرصەی دەور

زانا شکۆی سام ئەسکەندەرێشەن
مەرتەبەی بزورگ دانشوەرێشەن

ئەو (بزورگ ئومێد) نامش بێ مەنشوور
ئاگا بێ جە عیلم ئەرەستۆ دەستوور

طەڵەب کەرد وەبەر شەهەنشای عادڵ
پەی خوسرەو ئەو بەحر ژەرف دنیا دڵ

خوسرەو لاڵپۆش ئورەبیا سەرێر
نەجیب پاکزاد[25] ، ئەفلاتون تەدبیر

پەی ئیستیفادە جەو دەریای فەرهەنگ
پێ‌کا بە صەد ناز نە دامانش چەنگ

جە فەیض حیکمەت ئەو فەڕۆخ ئەندام
جە عیلم و حیکمەت ڕاسیخ بێ تەمام

هورمز دیش خوسرەو بەی دانشمەندی
بەی عەقڵ و شوعوور ، بەی دڵ پەسەندی[26]

فراوان کەردش شوکر خوداوەند
شیرین بێ جە لاش شیرینتەر جە قەند

---

(٢٥) نەجیب پاکزاد (ب) نێکزاد نێك نام .

(٢٦) دڵ پەسەندی (ب) هۆشمەندی .

پەی حیفظ ذاتی جە گاه مەظڵوم
بڕیش بێخ ظوڵم ظاڵمان[۲۷] شوم
پەی ڕاحەتی خەڵق ڕەمزی قەرار دا
گاڵ دا جاڕچیان جاڕ دا بە شاردا :
وەی بە کەسێدا بە طەرزو طەوری
بە بێ نەوایی منانۆ جەوری !
جەی سەبەب بە تێغ عەداڵەت چون جەم
بڕێش حەڵقـەی ظوڵم ، سیلسیلەی ستەم

* * * *

(۲۷) ظاڵمان ( أ ) غولامان .

# رفتن خسرو بباغ با غلامان[١]

مەعلوم بۆ جە لای سوخەن[٢] شکاوان
زومرەی مەعنا دان ، زوڵف خیاتەی خاوان
نە دێباچەی شۆخ ئەی نامەی[٣] نامێ
بەی دەستور من دیم نەظم[٤] ( نیظامێ )
جە قەزا ڕولێ خوسرەو دارا
کەفت نە خەیاڵش سەیران سارا
چەنێ چەند غوڵام نەوڕەسیدەی نۆ
خەت و خاڵ شیرین ، زوڵفان عەنبەر بۆ
وێش موزەییەن[٥] کەرد چەنێ ڕەخت زەڕ
سوار بێ وە ئەسپ سەنگ وە یەکدا هەڕ[٦]
شکار ئەفگەنان مشێ وە ڕاوە
وەشی مویەرا بە ڕۆی دنیاوە

---

(١) ڕۆیشتنی خوسرەو بۆ ناوباخ لەگەڵ نۆکەراندا .
(٢) سوخەن ( ب ) مەعنا .
(٣) نامەی ( ب ) دێبای .
(٤) نەظم ( أ ) بەزم .
(٥) موزەییەن ( أ ) موخەللەع .
(٦) سەنگ وەیەکدا هەڕ ( أ ) سنگ وە پڕ گەوهەر .

ناگاه نەظەر کەرد دیش نە عەرصەی دەشت
دیهکەدەیێ خاص چون ڕەوضەی بەهەشت

نە چوار دەورش چەشمە مدا جۆش
هەواش مبەخشا چون عەنبەر خرۆش[(٧)]

جە میرغوزارێ[(٨)] پڕ جە لالە و گوڵ
فەرماش شەهزادەی بەور دەریا دڵ

چەتر چیهرەیێ سەرا پەردە زەڕ
سـتون سیم صاف جە دانە و دوڕ پەڕ[(٩)]

هۆردان بە صەد ناز چون خەیمەی وەهار
وستن تێشدا فەرش نارنجێ[(١٠)] و گوڵنار

خوسرەو نیشت تێشدا ئەوڕۆ تا بە شەو
نۆشا بادەی ناب وێنەی کەیخوسرەو

چون نەسیم زار صوبح[(١١)] زەڕ نیـگار
شۆڵەی شەمع نور خۆر بێ ئاشـکار

هەم خوسرەو نەوجا ئاراست بیساطێ
بیساط ڕەنـگین پڕ جە نیشاطێ

---

(٧) هەواش .. تاد ( ب ) هەواش مبێزا بۆی عەنبەر فرۆش .
(٨) میرغوزارێ ( ب ) مورغزارێ .
(٩) جە دانە و دوڕ پەڕ (أ) پڕ جە دانە و زەڕ .
(١٠) نارنجێ و (أ) نارنج .
(١١) زار صوبح ( ب ) صوبح چەرخ .

جە نەغمەی سازان مەعرەکە بازیی
جە نەشئەی شەراب شیشەی شیرازیی
جە هەی چێپ .. هەی چێپ[12] مەیکەشان مەست
جە بشکەن .. بشکەن ساقیی مەی وە دەست
سەرشار بیی یەکسان خوسرەو لاڵپۆش
تا صوب ڕەوشەن هیچ ناما وە هۆش[13]
یەك غولامێ داشت[14] شوم ناپەسەند
جە باغیی قەدرێ قۆڕەی ئەسکۆر کەند
ئەسپ وێش بە دەست غولامیی سپەرد[15]
کشت مەظڵومێ بە تەمامێ وەرد
شەخصێ هۆرێزا جە ڕای نادانیی
عەرض کەرد وە پای تەخت هورمز نیهانیی
وات : خوسرەو ئیمشەو جە تۆ نەتەرسا
جە ڕای بێباکیی[16] خەبەر نەپەرسا
نیا نە یانەی دەروێش دڵ تەنگ
ساز ئەرغەنون چەنیی ساز چەنگ[17]

---

(١٢) هەی چێپ .. هەی چێپ ( ب ) هەی چەپ .. هەی چەپ .
(١٣) هیچ ناما وە هۆش ( ب ) بیی مەست و مەدهۆش .
(١٤) داشت ( أ ) بیی .
(١٥) ئەسپ . ناد ( ب ) ئەسپ ئەو بەدخوی نەفام نامەرد .
(١٦) بێباکیی ( أ ) نادانیی .
(١٧) ئەم شیعرە لە نوسخەی ( ب ) دا نیە .

ئەسپش کشت‌زار موسوڵمانان وەرد
غوڵامش قۆڕەی دیهقان بە جەور بەرد[18]

ئەر ظوڵمێ وەی طەور بێگانان[19] مکەرد
شەهەنشا یانەش بە غارەت مبەرد

هەرچەند کە خوسرەو بەرگوزیدەشەن[20]
فرزەند عەزیز نور دیدەشەن[21]

بەڵێ هەی جەم قەدەر فەرەیدوونی شان[22]
یە دوورەن جە عەدڵ نەوەی نەوشیروان

هورمز ئێد شنەفت دمرۆنش جلۆشا
جە ڕۆی عەدڵ و داد خیشمش خرۆشا

وات بە سەرهەنگێ ئەو شای هونەروەر
هەر دوو پای ئەسپش بڕی وە خەنجەر

ڕەختش چەنی زین ، ئەسبابش تەمام
داشان بە دەروێش بێچارەی سەرسام

---

(١٨) بە جەور بەرد ( أ ) تەمام کەرد .

(١٩) بێگانان ( ب ) بە کەسان .

(٢٠) بەرگوزیدەشەن ( ب ) بەرگوزیدەنەن .

(٢١) دیدەشەن ( ب ) دیدەنەن .

(٢٢) فەرەیدوونی شان ( ب ) فەرەیدوون نیشان .

جەودما بە ضەرب پاڵەی[۲۳] فەرەنـگی
مەڕدشان[۲٤] ناخۆن دەست و پای جەنـگی

ئەوڕۆ ئەو جەمشێد جە دانشوەری
جە ڕای عەدڵ و داد مسکێن پەروەری

خەفێف کەرد بەو طەور ئەو فرزەند وێش
ئافەرێن نەوەی نەوشیروان پێش

فرزەندێ وێنەی خوسرەو فەرزانە
بکەرێش وە پەند سەرکۆنەی تانە

جە لای سەلاطێن سکەندەر نەژاد
هەر بەی طەور مبۆ ڕەویەی عەدڵ و داد

مەعلوم بۆ جە لای بزورگان دەور[۲۵]
هەرکەس عادڵ بۆ چون هورمز بەی طەور

بەرگوزیدەی ذات حەیی ئەکبەرەن
مەحفوظەن جە نار گەر صەد کافرەن

(خانا) بۆ[۲٦]، وەسەن زوبان درازی
کۆن ئەو صاحیب عەدڵ تۆ پێش بنازی

---

(۲۳) ضەرب پاڵەی ( ب ) زۆر بەستەی .

(۲٤) مەڕدشان ( ب ) بڕدشان .

(۲٥) بزورگان دەور ( ب ) بەگـەران بەور .

(۲٦) بۆ (ب) سا .

کۆتا کەر ئەی حەرف بە داوان دەو
وێر دەر بە فرمان دڵـگیر خوسرەو

نەقشبەند لەوح شیرین فسانە
بەی طەور کێشا نەقش شۆخ[27] و مەستانە

وەقتێ خوسرەو دیێ جە شا ئەی خوارێ
شرۆع کەرد بە شێن زایەڵە و زارێ

چونکە خەجڵ بی[28] ئەو جە کردەی وێش
وات وە بزورگان دانای دەریا کێش

ئیستیدعام ئێدەن جە لای شەهریار
عوذر ئەی بەندەی شۆم شەرمەسار

بوازێ ، بێ حەد گرانەن دەردەم
تەمام شەرمندە و عاصێ و ڕەنـگ زەردم

ئێد کە شنەفتش وەزیر ئەعظەم
ئومەرای عیظام شای والا شیەم

چەنێ گرد ئەعیان جەمعییەت کەردن[29]
خوسرەو وە پای تەخت پادشا بەردن

جە دمای ئیظهار عەرض ئیلتیماس
خوسرەو لاڵ پۆش ڕاگەی حەق شناس

---

(٢٧) شۆخو (أ) شەرح .

(٢٨) بی (ب) مەند

(٢٩) جەمعییەت کەردن (ب) شەرمندە کەردن .

رۆ ماڵا جه خاك جه ڕۆ سیاهێ
ئەفشان كەرد ئەسرێن جه[30] پای تەخت شاهێ

واتش هەی جەمشێد عەطارید شیمار
بۆیەر جه تەقصیر بەندەی شەرمەسار

هەرچەند جەی گوناه ڕۆم بیەن سیاه
ئومێدم ئێدەن جه ئەڵطاف شاه

من وێنەی طیفڵێ شێت و دێوانه
نەكەرۆ وه پەند سەركۆنه تانه[31]

ڕاستەن سەنگیەن[32] من كۆگای گونام
ئاخر نه فرزەند شای جەم ئیحتیشام

ئێد كه وات دیێسان ڕۆ ماڵا نه خاك
خاك كەرد جه ئەسرێن سەراسەر نمناك

بزورگان دیێشان خوسرەو بە خوارێ[33]
نه پای تەخت شا كەردشان زارێ

شەهەنشا كه دیێش[34] بزورگان بەی طەرز
ئەویچ پەی خوسرەو فیراقش بێ بەرز

(30) ئەسرێن جه (أ) جه ئەسر .

(31) نەكەرۆ .. تاد (ب) نەكەردات بەی طەور ڕیسوای زەمانه .

(32) سەنگیەن (ب) سەراسەر .

(33) خوسرەو به خوارێ (ب) ئەو بوردەبارێ .

(34) دیێش (أ) دێ .

هۆرێزا بە وێش[٣٥] هۆرش گرت نە خاك
بۆسا ڕوخسارش بە دیدەی نمناك

فەرماش فرزەندم ئەوەند عاقل بۆ
ئەوەند جە كردەی وێش ئەو خەجل بۆ

فەرقش سزای تاج شەهریاریەن
ذاتش شایستەی جیهانداریەن

ئەوڕۆ جە لای لوطف شای والا مەقام
پەروێز لال پۆش[٣٦] صاحیب عەقل و فام

بە خەلوەت وێش هۆرش گرت[٣٧] بەردش
مومتاز بە خەلعەت خوسرەوی كەردش

بە (حسب الرقم) وەلی عەهد وێش
(بلا تعلل) دەر ساعەت دەر پێش[٣٨]

مەعلوم بۆ جە لای عارفان دەور
دانا بزورگان شیرین طەرز و طەور

فرزەند صالح (قرة العین)ەن
صەیقەل ژەنگار، ئاینەی زەینەن

---

(٣٥) بە وێش (أ) پەرێش.
(٣٦) لال پۆش (ب) لال بەخش.
(٣٧) هۆرش گرت (ب) هۆر گرتش.
(٣٨) ڕاست وایە لەجیاتی (وەلی عەهد)، (وەلی عەهدی)، وە لەجیاتی (دەر پێش)، (دا پێش) بێ.

ئەر ناصاڵح بۆ ، ( عاق والدین )
فەتڵش واجبەن ، بە گەردەنم دەین

* * * *

# نشستن خسرو بر تخت شاهی[1]

تۆتۆی شەکەر ڕاز خامەی خۆش تەقدیر
بەی طەور ئینشا کەرد شیرین طەرز و تیر[2]

خوسرەو چون بەرشۆ جە مەعرەکەی سەخت
وێنەی کەیخوسرەو مومتاز بۆ بە بەخت

سیپاش وێنەی شەمع تەجەللای کڵای طوور
مدرەوشا بە لوطف[3] خوداوەند جە نوور[4]

چون بە حوکم ذات (لااحصی) صیفات
جەناب ئەقدەس (جاعل الظلمات)

ئەو[5] وێنەی عاشق دەرزن سفتەی داخ
چون زوڵف پەشێو بی، پەرێشان دەماخ

---

(١) دانیشتنی خوسرەو لەسەر تەختی پادشایی . ئەم سەرباسە هەر لە نوسخەی (ب)دا هەیە .

(٢) ئەم شیعرە لە نوسخەی (ب)دا بەمجورەیە :

نۆتۆی خۆش تەقریر خامەی شەکەر ڕێز
ئینشا کەرد نەوای شیرین و پەروێز

(٣) بە لوطف (ب) جە فەضڵ .

(٤) نوور (ب) دوور

(٥) ئەو (أ) زۆ .

شەمەن زار زۆ چون وەنەوشەی شەو
سیا بی چون زوڵف شیرین خوسرەو
پەرویز بەی طاعەت یەکتای یەگانە
کەمەر بەست و شی بە طاعەت خانە
دەمێ طاعەت کەرد بە ئاە سەردەوە
ئاخر جە ناکاو خاوش بەردەوە
ناگاە نەوشیروان عەداڵەت دەستوور
ئاما نە خاوش وێنەی شەمع نوور
واتش هەی فرزەند فرۆزندە بەخت
بەراڕندەی تاج ، پادشاهی تەخت
بێ دەماخ مەبەر فەرخوندەن بەختت
پەی ئەسپ و غولام ، پەی زێن و ڕەختت
هەرچەند جە عەرصەی دنیای پڕ مەلال
ترشێت چەشت[٦] جە پەی قۆرەی ترش و تاڵ
مدۆ تەلافێت بێ شك خوداوەند
شەخصێ شەکەر ڕاز شیرینتەر جە قەند
چون بە ئەمر شاە ئەسپت پەی کەردن
وە جای بادەی ناب[٧] خەفەت پێت وەردن

---

(٦) چەشت (ب) دی .

(٧) وە جای بادەی ناب (أ) زەڕزەمێ بادەی .

نەشنەفت کەس جە تۆ یەك حەرف سەردڵی
نەنیشت بە خاطر شەرێفت گەردڵی
شاد مبێ وەڵڵا[8] تۆ وە شەبدێزڵی
بە ڕەفتار نەسیم سوب سەحەر خێزڵی
بە دیهقان هەرچەند هەم داشان ڕەختت
نیشانەی سەعدەن پەی تاڵەی بەختت
ڕاستەن کە سفتەن دەروێت جە داغ
ناخوێن چنگت مەڕدن بە چۆماغ
خاترت جەم بۆ (باربود) نامێ
سازندەیێ شۆخ ، شیرین کەلامێ[9]
مکنۆ بە دەستت نە ڕوی سەرزەمین
نە قەیصەر دارۆ ، نە خاقان چین
شەهزادە جە خواب شیرین بێ بێدار
بەردش سوجدەی شوکر خوداوەند صەد جار[10]
تا چەندڵی خوسرەو سازێش بێ داخش
جە شادیێی ئەو خاو بەرز بێ دەماخش

---

(٨) وەڵڵا (ب) بیللا .

(٩) کەلامێ (ب) مەقامێ .

(١٠) ئەم شیعرە لە نوسخەی (ب)دا بەمجۆرەیە :

شەهزادە دەر دەم هۆرێزا جە خاو
بەردش سوجدەی شوکر خوداوەند بە ناو

هەرچەند شەو چەنێ دانای سوخەن سەنج
سەڕڕاڤان دەور کیمیای کۆی گەنج
بە تەمای ئەو خاو خاستەر جە دارا
تا وە صوبح دەم وەشێ مویارا

* * * *

# حکایت کردن شاپور از شیرین[1]

نوێسندەی نەظم ئەی نامەی نامێ
بەی طەور کەرد تەصدیق گوفتەی ( نیظامێ )

شەخصێ شاپوور نام فەرد فەرزانە
جیهان دیدەی دەور شیرین فسانە[2]

نەقش بەندێ چون ئەو ، چەنێ ؟ پڕ شعوور
ڕەسسامێ[3] چون ئەو ئوقلیدس دەستوور

دانایێ چون ئەو بەلاغەت مەشحوون
پەیدا نمەبێ جە ڕوبع مەسکوون

خاستەر جە مانێ نەققاش تەڕ دەست
نەقش خەیاڵێ نە ڕوی ئاو مبەست[4]

هەر شەو نە پای تەخت خوسرەو دارا
چەنێ نەدیمان بە عەیش مویارا

---

(١) قسە کردنی شاپوور لەبارەی شیرینەوە .

(٢) لە نوسخەی ( ب )دا ( فەرد فەرزانە ) و ( شیرین فسانە ) لەجێی یەکتردان .

(٣) ڕەسسامێ ( ب ) ئوستادێ .

(٤) نەقش . . تاد ( أ ) نەقش ئەسلەمێ نە ڕوی ئەدەب بەست .

شەوڵی هۆرێزا بە صەد[٥] ئیحتیرام
بۆسا پای سەرێر پەروێز جەم جام
ئاخر وانش هەی[٦] (ظل آلهـي)
زێبندەی ئەورەنـگ فەڕبەخش شاهێ
بێ حەد نە پایەی گەردوَن شەش طاق
طەی کەردم جیهان ئافاق بە ئافاق
جە لای (مەهستان)[٧] نە دەریای دەربەند
مەریەم قەدرێ هەن دانا دڵ پەسەند
جە نەسل شاهان ئەعلای قەدیمەن
وێنەی ئەسکەندەر سوپاش عەظیمەن
بەس کە[٨] بێ حەدەن گەنج و ئەسبابش
نمەیۆ نە ضەبط دەفتەر حیسابش[٩]
جە جینس چارەیێ[١٠] ، جە مورغ و ماهێ
جەم کەردەن تەمام[١١] جە گەنج شاهێ[١٢]

---

(٥) صەد (أ) چەند
(٦) ئاخر وانش هەی (أ) وانش بە خوسرەو .
(٧) مەهستان (أ) قەهرەمان .
(٨) بەس کە (ب) یەکجار .
(٩) نیوەی یەکەم و دۆهەمی ئەم شیعرە لە نوسخەی (ب) دا لەجێی یەکتردان .
(١٠) چارەیێ (ب) چارپا .
(١١) تەمام (ب) فێشتەر .
(١٢) نیوەی یەکەم و دۆهەمی ئەم شیعرەش لە نوسخەی (ب)دا لەجێی یەکتردان .

شۆش نیەن ئەمما بە کامەرانی
موبارۆ[١٣] دەوران ئەی دنیای فانی
کۆس خوسرەویش وێنەی ئەسکەندەر
نالەش مویەرۆ جە چەرخ ئەخضەر
(شەمیرا)[١٤]ش نامەن ئەو خاڵ سۆسەنی
شەمیرا بە لەفظ خەڵق ئەرمەنی
(هەمین بانو)ەن ئەصڵ تەفسیرش[١٥]
نیەن نە عەرصەی دەوران نەظیرش
فەصڵ تابوستان کۆی ئەرمەن جاشەن
لالەو شەقایق گشت فەرش پاشەن
وەقت نەوبەهار وێنەی دەستەی گوڵ
نە موڵك موغان[١٦] مگێرۆ مەنزڵ
وادەی نەو سووەیل ڕەنگ ڕۆی ڕەزان
نەخش نوختەی خاڵ سەرپەنجەی خەزان
چون شاباز شۆخ توند تێز پەرواز
پەی نەخچیر بە سۆز مەیۆ بە ئیجاز[١٧]

---

(١٣) موبارۆ (أ) موبارا .

(١٤) شەمیرا (أ) شیمرا ، هەڵەی نوسیارە بۆیە لە نیوە شیعری دوەمیشدا ، کە لە هەردو نوسخەکەدا بە هەڵە نوسرابو ، ڕاستمان کردەوە .

(١٥) تەفسیرش (أ) نەفیرش .

(١٦) موڵك موغان (أ) مەلیك مەکان .

(١٧) بە ئیجاز (أ) نە پەرواز .

زمستان ( بەردەع ) چون هەواش گەرمەن
فراوان وەشەن ، نەسیمش نەرمەن
چون ئاهوی میشکین مەهـ بەرە[18]ی ساوا
شۆخ شۆخ مەست مەست مشۆ بەو ماوا
چون تەتار شۆخ کەمەند نە پێڵەن
بەی دەستور چار فەصڵ نە گەشت و گێڵەن
یە چەندێ ساڵەن تا بە ڕۆی ئارۆ[19]
بەی طەور وە شادی[20] دنیا مویارۆ
واریش نیەن[21] هیچ کەس نە جایێ
بەڵێ ئەو دارۆ یەك برازایێ
نە عەرصەی دنیا وێنەی ئەو دڵبەر
نیەن نە پەردەی خاقان و قەیصەر
خەیلێ ئەو[22] نەققاش جیهاندیدەی فەرد
تەعریف و تەحسین ( مەهتین بانو )ش کەرد[23]
جەودما بە وەصف شیرین ئەرمەن
کەردش بەی دەستور وێش شەکەر شکەن

---

(١٨) مەهـ بەڕەی (ب) سوب خێز .
(١٩) تا بە ڕۆی ئارۆ (ب) بەی طەور تا ئارۆ .
(٢٠) بەی طەور وە شادی (ب) دایم بە شادی .
(٢١) واریش نیەن ( أ ) واریث نەدارۆ .
(٢٢) خەیلێ ئەو ( أ ) سا بەی طەور .
(٢٣) تەعریف و . . تاد ( أ ) تەعریف ئەسباب ( مەهتین بانو ) کەرد .

واتش هەی خوسرەو کەیخوسرەو صیفات
ئەو شەخص بەی دەستوّر[٢٤] عەرض کەردم جە لات

قامەتش قیام قیامەت خیّزەن
خەرامش ئاشوب رِۆی رِەستاخیّزەن
پیّشانیچش پرشنگ نوّر جیّش مخیّزۆ
حوسنش بوّم[٢٥] قورص قەمەر مبیّزۆ
ئەبرۆش قوللەی قەوس سەخت[٢٦] پرِ زۆرەن
خەدەنگش تا حەشر[٢٧] زامش ناسۆرەن
مۆرەش چون خەدەنگ شەهاب ئەنجوم
ئەر بکنۆ وە سەنگ تا پەرِ مبۆ گوم
( نعوذ بالله ) جە غەمزە و نازش
نە نیم نیگای ناز دیدەی شەهبازش
سەوگەندم بەو تاج شەهەنشای جەم جا
ئەر شیّخ مورشید نە ( کعبة الله )

بوینۆ وە چەم شۆخیی شیّوەی ئەو
چین دەستەی زولف لوول لیّوەی ئەو

---

(٢٤) ئەو شەخص بەی دەستوّر (ب) تەعریف ئەو شەخص .

(٢٥) بوّم ( أ ) نوّر .

(٢٦) سەخت ( أ ) تەمام .

(٢٧) حەشر ( أ ) چرِ

چون (شێخ صەنعان) موبتەلا[۲۸] زوننار
مشۆ[۲۹] نە مەذهەب طایفەی کوففار

عەجەب ظاڵمەن کوشندەی بێ پێر[۳۰]
هیچ کەس بە کەمەند گێسوش نەبۆ گیر

سەرشارەن ، شۆخەن ، شیرینەن ، ڕەندەن
شەوقش شۆڵەی شەمع کافوری[۳۱] سەندەن

هەرچەند کە مدیەی چون (تەرسا)ی چینی
هیچش کەم نیەن جە نازەنینی

خاڵ ناو لێموش غارەتچی‌ی دینەن
زێبندەی سەرکار فەخفور چینەن

باش خاقانان ئێران زەمینەن
بەهای هەر ماچش موڵك ماچینەن

بۆی طوڕڕەش چون ناف مودبیرەی خوتەن
میشك ئامێز[۳۲] کەردەن سارا و کۆی ئەرمەن

---

(۲۸) موبتەلا (أ) مبەندۆ .

(۲۹) مشۆ (أ) مدۆ .

(۳۰) پێر : ڕاست وایە (تیر) بێ

(۳۱) شۆڵەی شەمع کافوری (ب) ڕۆ جە شەمع نەجەللی .

(۳۲) ئامێز (ب) ئارا .

لەعلش[٣٣] وێنەی لاڵ دانەی بەدەخشان[٣٤]
تێشدا چەند دانەی مرواریی ڕەخشان[٣٥]
یێنێش چون ئەنگوشت ئاڵای پەیغەمبەر
ماچێ بە ئیعجاز شەق کردەن قەمەر[٣٦]
یەک نوختە خاڵێ شەو ڕەنگ بۆ ناف
ها نە پای زنجش چون فەیرۆزەی صاف
هەرکەس موینۆ نوختەی ئەو خاڵە
مبۆ بە واتە پەی هەزار ساڵە
مێنای گەردەنش چێش[٣٧] واچێن چێنەن
ڕەخشانتەر جە عەکس دوڕڕ مەکنێنەن
سێنەش شەوق[٣٨] مدۆ چون ستارەی شەو
نە حەد ویەردەن وەصف لێمۆی ئەو
سەر تا پاش چون سەوڵ ساوای[٣٩] نەو خێزەن
نافەی میشک جە بۆی نافش لەب ڕێزەن

---

(٣٣) لەعلش (أ) لەعل .
(٣٤) بەدەخشان (أ) بەدەخشەن .
(٣٥) ڕەخشان (أ) نەخشەن .
(٣٦) ئەم شیعرە لە نوسخەی (أ) دا نیە .
(٣٧) چێش (ب) چۆن .
(٣٨) شەوق (ب) سۆ .
(٣٩) ساوای (أ) سایەی .

ئاهوی خوتەن خێز بۆ عەنبەرێنەن
چون شیرێن شێوەن نامش (شیرێن)ەن
نیەن بە شۆخیی ئەو نازك صەنەم
هیچ کەسێ[٤٠] نەدیەن عەرەب تا عەجەم
چون حەڵقەی زنجیر زوڵف دەستەشەن
هەفتاد پەرستار کەمەر بەستەشەن
دەستەی زوڵفانش گشت بۆ عەنبەرەن
هەر یەك جە یەکێ[٤١] شۆخ و شەنگ تەرەن
شیرێنەن چون قەند[٤٢] ڕێزەی ڕازشان
خوێنڕێزەن دایم[٤٣] غەمزەی نازشان
مکەران[٤٤] بە خەصم نە ڕوی عەرصەی جەنگ
بە حەربەی خوێنڕێز دەور دنیا تەنگ
ماچێ باڵاشان جە نور سروشتەن
ئەوان چون حۆری[٤٥] ، (ئەرمەن) بەهەشتەن
(شیرێن) وەلیێ عەهد (مەهێن بانو)ەن
چون مەهێن بانو ئەویچ بێ شوەن

---

(٤٠) هیچ کەسێ (أ) دانایان .
(٤١) یەکێ (ب) ڕەنگێ .
(٤٢) چون قەند (أ) دایم .
(٤٣) دایم (أ) جە خوێن .
(٤٤) مکەران (ب) مگێڕان .
(٤٥) حۆری (أ) حوّرن .

ئەو مەهتێن بانۆ شای سۆسەن خاڵان
سالار سەرکێش ئەو نەونیهاڵان

نە سەرکارش‌دا ئەسپێ باد بێزەن
چونکە شەو ڕەنگەن[٤٦] نامش (شەودێز)ەن

بە ڕەفتار جە باد سوبوکخێزتەرەن
شایستەی شاهان صاحێب ئەفسەرەن

هەر نە پەروازەن دایم وە بێ پەڕ
زنجیرش تەڵا ، مێخ زنجیر جە زەڕ

شاپوور نەقش‌بەند[٤٧] نادرەی ڕۆی دەور
پەی خوسرەو پەند کەرد تەعریفش[٤٨] بەی طەور

بەدتەر بێ جە قەیس سەرگەشتەی[٤٩] ئەییام
زەڕڕە پێش نەمەند عەقڵ و هۆش و قام

سوڵطان شادیش نە صەفحەی ضەمیر
گوریزا بە جەخت چون باد شەبگیر

* * * *

---

(٤٦) شەو ڕەنگەن (ب) شەودێزەن .
(٤٧) نەقش‌بەند (أ) بەخشندەی ، لام‌وایە (نەخشندەی) بێ و بە هەڵەی نوسیار گۆڕابێ .
(٤٨) تەعریفش (أ) تەعریف .
(٤٩) سەرگەشتەی (أ) بەرگەشتەی .

# روانه نمودن خسرو شاپوررا بأرمن بجهت شیرین[١]

مونشیی ئینشای شەرح[٢] ئەی شیرین نامە
بەی طەور بە خامەی میشکین شەمامە
کێشا کەتیبەی[٣] ئەی طەرح قەند بێز[٤]
شەیدا بی جە عەشق شیرین و شەودێز[٥]
واتش هەی شاپور جیهان گەردیدە
دانای موو شکاف سوخەن سەنجیدە
حەرفت گشت مەربوط ، واتەت سەنجیدەن[٦]
پەسەندیدەی تۆ گشت پەسەندیدەن
حەق عەقڵ و دانش پەرێت[٧] کیاستەن
هەرچی کە واتت بێ درۆ ڕاستەن

---

(١) ناردنی شاپور لەلایەن خوسرەوەوە بۆ ئەرمەنستان بۆ دەس‌خستنی شیرین .
(٢) شەرح : ئەم وشەیە لە نوسخەی ( أ )دا نیە . بەم بۆیە ئەبێ (ی)ی مونشی بە (هەمزە)یەکی لەسەر وەستاو بخوێنرێتەوە ، واتە ( مونشیی ) .
(٣) کەتیبەی (ب) نیشانەی .
(٤) قەند بێز (ب) جام ڕێز .
(٥) شیرین و شەودێز ( أ ) چون پەروێز .
(٦) واتەت سەنجیدەن ( أ ) ذاتت حەمیدەن .
(٧) پەرێت (ب) پەی تۆ .

عەجەب ئاهیرێ[8] وستێ نە جەرگم
ساکن نمەبۆ تا بە ڕۆی مەرگم

بە چ وەصفێ بێ تۆ پەی من کەردی
بێ مروەت ، تاقەت تەوانام بەردی

یا بە جەستەی قەیس[9] پەی لەیلا سەرسام
عەقڵ و هۆش چون باد گوریزا جە لام

یانەت وێران بۆ[10] ، وێران بێ یانەم
عەقڵم شێ جە دەست ، کەردێ دێوانەم

سا کە چون وەی طەور زامم بێ کارێ
چێش مبۆ جە ڕای خزمەت گوزارێ

سوبوکتەر جە باد سوبخێز خوتەن
بشێ وە پای تەخت شیرین ئەرمەن

ئیظهار کەی جە لاش ڕەستاخێز[11] من
دوێ هەناسەی دەیجوور بێز من

واچی خوسرەوێ دارای دەریا دڵ
نەوەی نەوشیروان پادشای عادڵ

---

(٨) ئاهیرێ (ب) ئایرێ .

(٩) بە جەستەی قەیس (ب) وێنەی مەجنۆن .

(١٠) بێ (أ) بۆ .

(١١) لاش ڕەستاخێز (أ) لای ڕەستخێز .

یە چەندێ وەختەن وەصفت شنەفتەن
جە شاهێ و جە تەخت خوسرەوێ کەفتەن
وەختەن چون مەجنوٙن ڕیسوای زەمانە
بشوٙ بە چوٙڵدا ببوٙ دێوانە
ئەر چون ئوستورلاب موٙم حەرفش نەرمەن(١٢)
پەی نەخچیر چون باز خوٙش خوٙ و سەرگەرمەن
بکیانە بە دەو(١٣) چون باد صوب خێز
نامەی فەرەح بەخش موشتاقێ ئامێز
وەر جە تاڵەی من موٙبەتش سەردەن
چون موٙرەی نەرّاد دایم کەج گەردەن(١٤)
باز هەم بە تەعجیل زوٙ مەکەر بە شەو
باوەرە(١٥) پەرێم زوَ(١٦) هەواڵ ئەو
سا کە ئێد شنەفت شاپوٙر جە پەروێز
توٙتێی زوبان کەرد وەی طەور شەکەر ڕێز

(١٢) ئەر چون .. تاد (أ) ئەگەر وێنەی موٙم حەرف ئەو نەرمەن .
(١٣) بکیانە بە دەو (ب) ئیرسال کەر بە ئەو .
(١٤) دایم کەج گەردەن (ب) گەردەن کەج گەردەن .
(١٥) باوەرە (أ) بکیانە .
(١٦) زوٙ (أ) وەش . ئەم وشەی (زو)ە لە نوسخەی (ب)دا بە (ڕوٙ) نوٙسراوە ، بەلاّم دیارە هەڵەیە چونکە یەکەم (ڕوٙ) لێرەدا دەس نادا . دوٙهەم (وەش) و (زوٙ) مەعنایان یەکە ، نەك (وەش) و (ڕوٙ) . لەبەرئەوە ڕاستمان کردەوە و کردمان بە (زوٙ) .

